## کوردم ئەمن

گەرچی توشی ڕەنجەڕۆییو حەسرەت و دەردم ئەمن
قەت لە دەس ئەم چەرخە سپڵە نابەزم، مەردم ئەمن
ئاشقی چاوی کەژاڵ و گەردنی پڕخاڵ نیم
ئاشقی کێوو تەلان و بەندەن و بەردم ئەمن
گەر لە برسان و لەبەر بێبەرگی ئیمڕۆ ڕەق هەڵێم
نۆکەری بێگانە ناکەم تا لەسەر هەردم ئەمن
من لە زنجیرو تەناف و دارو بەند باکم نیە
لەت لەتم کەن، بمکوژن، هێشتا دەڵێم کوردم ئەمن

شیلان ئاوی 1321—1942

## گلێنەی شاعیر

ئەگەر خەرمانی عومرم ئێستەکانە پاکی با بیبا
بە مەرگی تۆ مچورکیشم بەدڵدا نایە، بابیبا
هونەر گەرخۆی پەرێشانی نەبایە لەم وڵاتەیدا
بەشی من بۆ دەبوو چارەڕەشیو خانەخەرابی با
لە کوێ حاڵی من و تۆ وادەبوو ئەی خۆپەرست ئێستا
ئەگەر دنیا ئوسولێ و قاعیدەو نەزم و حیسابی با
بە جامێ بادە تێر نابم، ئەگەر مەیلت هەیە ساقی
گلێنەی خۆم دەنێرمە خزمەتت، بۆم تێکە تا بیبا
وەبەر من نایەڵێ لێرەش مەیو ساقی جەنابی شێخ
دەنا لەولا شەراب و حۆری با هەر بۆ جەنابی با
هەموو عومری ئەبەد تیێدا نیە خۆشی دەمێك مەستی
خدر ئاوی حەیاتی بۆچ بوو؟ فێری شەرابی با

1340

## ڕەق هەڵاتم

من لە داخی خزمی خوێڕیو ئاشنای ئەحمەق هەڵاتم
من لە ترسی زاق و زووقی ئەمنیەی چاو زەق هەڵاتم
کوا بە خۆشی خۆم بەجێ دێڵم وڵاتی خۆشەویستم؟
من لە ترسی زللەو باتووم و دارو شەق هەڵاتم
هەر بە پێیان و بە کۆمەکۆمە گەیمە ئەم وڵاتە
ڕەنگە پێتوابێ بە سواری مایەنی گوێ لەق هەڵاتم
(نۆکەری بێگانە ناکەم) هاتەجی فەرمایشی خۆم
وا لە برسان و لەبەر بێبەرگی ئیمڕۆ ڕەق هەڵاتم

1347

## سنور

ئەی ئەو کەسەی دەتپەرستم و لێم ونی
تۆ خودا نی، تۆ خۆشەویستی منی
* * *
لە ئاسمان نی تا وێت ڕانەگا دەستم
لە قاف نی کاڵەی ئاسنت بۆ هەڵبەستم
* * *
تۆی لە من ون کردو منی لە تۆ دور
ئەو بستۆکەی دوژمن ناوی نا سنور

بەفرانباری — 1351

## بۆسەی ڕۆژگار

نیمە ئاواڵێ لە گۆشەی بێکەسیدا غەم نەبێ
چاکە ئەو لێرەش وەفای هەرماوە، سایەی کەم نەبێ
لاپەڕەی ژینم هەموو هەڵدەیتەوە تێیدا نیە
باسی فرمێسك و هەناسەو شیوەن و ماتەم نەبێ
ڕۆژگاری سپڵە بۆ من بۆسەیەکی نایەوە
نەمدی هەر تیرێکی دەیهاوێ بەرەو سینەم نەبێ
ڕەنجی دوری دڵبەرم بۆ کوشتنی من کافییە
گەر لە دنیادا ئەمن هیچ مەینەتی دیکەم نەبێ
کوا دەزانێ چەند پەرێشان و پەشێوە حاڵی من؟
ئەو کەسەی گیرۆدەی ئەگریجەو پەرچەم نەبێ
ڕەمزی دڵداری لە زینێ فێر نەبوو یارم دەنا
کوا ئەوینداری وەفاداری وەکو من، مەم نەبێ؟
کیژی شاریمان لە خۆی وەرگرتوە چارشێوەی ڕەش
داخەکەم نەمدی لەوێ مانگێکی دەورەی تەم نەبێ
شادی جارێکی بە میوانی نەهاتۆتە دڵم
ڕەنگە خەڵوەتخانەیی خەم شوێنی نامەحرەم نەبێ
خۆم دەسووتێنم هەتا بەزمی خەڵك ڕۆشن بکەم
کێ لە ڕێی خەڵکا وەکوو شاعیر دەسووتێ شەم نەبێ

1338

## یادم بکەن

لەودەمەیدا پیاڵە دەدرێن لە پیاڵە
لەودەمەیدا لێوتان بە بادە ئاڵە
لەودەمەیدا کۆڕی شادی دەبەستن
لەودەمەیدا سەرخۆش و مەستی مەستن
لەودەمەیدا کە دەگرن بازو دەروان
لەودەمەیدا دەس دەگێڕن لە بەروان
لەودەمەیدا دەس لە بەژنان وەردێنن
لەودەمەیدا بەرکۆژە دەترازێنن
لەودەمەیدا گەڕی ڕەشبەڵەك گەرمە
لەودەمەیدا دەگوشن کام پەنجە نەرمە
لەودەمەیدا دۆ دەکەنە خۆڕانان
لەودەمەیدا کە دەگوشن گوڵمەی ڕانان
لەودەمەیدا تامەزرۆن لە جێژوانان
لەودەمەیدا بەخۆوە دەگوشن جوانان
لەودەمەیدا گڕ دەگرێ مەیل و تاسە
لەودەمەیدا تێك هەڵدەنگوەن هەناسە
لەودەمەیدا کە دەمژن شەکرەلێوان
لەودەمەیدا نەبێ لەمپەرو نێوان
لەودەمەیدا پۆلی بێریان ڕادەبرن
لەودەمەیدا کیژ چاوتان لێدادەگرن
لەودەمەیدا گوێ هەڵدەخەن بۆ تارێ
لەودەمەیدا (ماملێ) دەڵێ قەتارێ
یادم بکەن، یادی منی دوروڵات
یادی منی ڕێبواری ڕێگای خەبات
یادی منی بێبەش لە خۆشیو شادی
یادی منی سەوداسەری ئازادی

1973/11/21

## شەنگەبێری

شەنگەبێری! ساڵی ساڵان لە کوێستانی، لەناو مەڕی
بۆ مەڕدۆشین هەڵت دەکرد ئەو باسکی سپی مەڕمەڕی
لەبەر هاڕەی گۆبەرۆك و گوارەو کرمەك و ژێرچەنە
نیوەڕۆیە لەبەر بێرێ کۆڕی مەڕی ڕادەپەڕی
* * *
کە ئێواران کەزیت دەکردن سێبەنگێو چاوت دەڕشت
بەو کەزیو چاوە نەرمانە بێڕەحمانە شوانت دەکوشت
شەنگەبیزا بە سروەبا سوژدەی دەبردە بەر بەژنت
ئاخر تۆش هەوای کوێستانی ئەو کوردستانەت هەڵدەمشت
* * *
چێشتەنگاوان لە دەراوان کە خۆت لێدەکرد پێخاوس
بە لەنجەولاری کیژانەت شەرمەزار دەبۆوە تاوس
ئاهەنگی ژین و شادی بوو بەیانی کە تێکەڵ دەبوو
شمشاڵی من، خرمەی بازن، گرم و هۆڕی مەشکەی گاوس
* * *
شەنگەبێری گراوی خۆم وێنووسی جەماڵ و جوانی؟
ئێستاش پاڵێنێ وەك جاران لە شوان و مێگەل دەڕوانی؟
وا من پێشمەرگەم دەجەنگم بۆ وڵاتی لەتۆ شیرنتر
نەمدەدا بە تەختی شایی دەنا بەردەبێری شوانی
* * *
ڕاستە تۆ جوانی، لە باری، نازداری، شۆخی، نەشمیلی
کوڵمت گەشترن لە گوڵ و خاڵت ڕەشترن لە زیلی
جیابوونەوەت دەردە، بەڵام تۆش دەزانی تامی نیە
ژوان و شەوڕاو و دڵداری، ڕازو نیازی بەدیلی
* * *
زۆری نەماوە بێتە بەر نەمامی هەوڵ و خەباتم
لە داگیرکەر پاك بێتەوە خاکی پیرۆزی وڵاتم
چەکم دادەنێم، گۆچانەکەی جارانم هەڵدەگرمەوە
تۆ هەر بیریبە، من هەر شوان، فریشتەی تاسەو ئاواتم

چیا- 1347

# ئەزمونی شاعیریم

خوشك و برا خۆشەویستەكانم!

بە ڕاستی نازانم چۆن هەستی گرگرتووی دەروونی خۆك دەرببڕم! نازانم بە چ زمانێك شوكرانەی چاكەی ئێوەی خۆشەویست بێژم، زمان و قەڵەمم لە دەربڕین و نوسینی سوپاسی ئەو هەمووو لوتفەتان لاڵ و كوڵن!.

ئەگەر لە بیرتان بێ، لە بەشی دوایی سەرەتایی دیوانەكەمدا لە "لەكوێوە بۆ كوێ"دا وام نوسیوە.

"لێرەشدا دەمەوێ شتێك بڵێم، بە پێچەوانەی زۆر هونەرمەندی كورد من لە نەتەوەكەی خۆم ڕازیم، كەس تا ئێستا بێحورمەتی پێنەكردوم، داوای دراوو ماڵیشم لە كەس نەكردوە تا بزانم دەمداتێ یان نا؟!. لە لێقەومانیشدا نانیان داومێو ڕایان گرتووم، شیعریشم تەنیا بۆ ئیحساسی خۆم داناوەو هیچ هەقم نییە منەتیان بەسەردا بكەم".

لە قوڵایی دڵمەوە بڕوام بەو قسە هەیە، كاتێك گەرای شیعرێك لە مێشكمدا دەگورێ، ڕوداوێكی جیهان سەرنجم ڕادەكێشێ، كاتێك مەسەلەیەكی ژیان هەستی دەروونم دەهاروژێنێ، من بە پەلەم هەرچی زووتر ئەو هەستە دەربڕم!.

خۆم لەو تەنگەژەو گێژاوە ڕزگاربكەم و بحەسێمەوە. كەوابوو، چ هەقم هەیە منەت لەسەر خەڵك بكەم و بڵێم شیعرم بۆ داناون؟!.

لە ڕێگەی شیعرو نوسینەوە، وەك تاكێك لە كۆمەڵ، تەنیا توانیومە كەم تا كورتێك ئەركێكی سەرشانم بەجێبگەیەنم و لە باتی ئەوەی بە زمانی خوێندنم كە فارسییە بنوسم، بە زمانی زگماكیم نوسیوەو ئەوەندەی لە دەستم هاتوە خزمەتی زمان و ئەدەبی كوردیم كردوە. ئەوەش ئەركی نەتەوایەتی خۆمەو ئەگەر بەجێمنەگەیاندبا، لەكن ویژدانی خۆم شەرمەزارو ڕوو زەرد دەبوم و دیسان هەقم نییە خەڵك منەتبار بكەم و چاوەنۆڕی پاداش بم. كەچی هەست دەكەم و دەبینم و زۆر لە ڕادەی پێویست زیاتر لە لایەن ڕۆڵەكانی گەلەكەمەوە ڕێزم لیدەگیرێ. هەر پێكهاتنی ئەم كۆڕە نیشانەی ئەوپەڕی ڕێزلێگرتنی ڕۆڵە پاكەكانی كوردە لە خزمەتكەرانی بچوكی گەلەكەمان و دەبێتە هۆی پتر هاندانی ئەوان بۆ من و فیداكاریو گیانبازی پتر لە ڕێگای ئامانجی پیرۆزدا.

لە "لەكوێوە بۆ كوێ"دا كەمێك بەسەرهات و ژیانی تاڵ و پڕ كوێرەوەری خۆمم بۆ گێڕاونەتەوە.

دیارە لە بنی كوولەكەم نەداوە، لێفەم لەسەر هەتیوان هەڵنەداوەتەوەو ئەسكووم لە مەنجەڵ نەگێڕاوە.

زۆر نهێنی گرنگ و ڕازی نەگوتراو هەروا بەسەر مۆری لە سنگمدا ماونەتەوەو دەیانبەمە ژێر گڵ.

ئەگەر ڕۆڵەی گەلێكی لێقەوماو نەبومایەو لە كۆمەڵێكی دواكەوتوودا بەرێ نەچووبام زۆرم لەو ڕازانە دەدركاند.

بە هیوام ئەگەر مەرگ بەر بینگم پێنەگرێو، ڕۆژگار دەرفەتم بدا (لە كوێوە بۆ كوێ) بكەمە كتێبێكی سەربەخۆو پەردە لەسەر زۆر لەو ڕازانە هەڵدەمەوە كە زیان و قازانجیان تەنیا بۆ خۆم دەگەڕێتەوە.

بە بیرم نایە بە منداڵی قەت بیرم لەوە كردبێتەوە كە بە گەورەیی ببمە شاعیر، یان نوسەرو ئەدیب، پێم خۆش بوو ببمە دوكتۆرو ئەفسەرو شتی وا.

تا لە قوتابخانەی سەرەتایی بووم فەرقێكم لە نێوان دەرسەكانمدا نەدەكرد. لە ئینشاو ئیملاو حیسابدا دەرەجەی وەك یەكم هێناوە. بەڵام كە باوكم هاتە سەر ئەو ڕایەی ئەگەر لە قوتابخانەی نوێدا بخوێنم بۆ دینەكەم زەرەروەر دەبێ. بچمە حوجرەی فەقێیان ببمە مەلاو جێی باب و باپیرانم بگرمەوەو كەوێی دامێن و سەڵتەو جوببە لەبەربكەم، گۆڕانێكی فیكریم بەسەردا هات كە باری ژیانیشمی گۆڕی.

نازانم، ئەو زوڵمەی باوكم لێی كردووم و نەیهێشت بە ئارەزووی خۆم بخوێنم و پێی بگەم و ویستی بمكا بە مەندیل بەسەرو عەبا بە شان وێی بەسەر هێنام، یان هاودەمیو هاونشینی لەگەڵ ئەو مەلاو فەقێیانەی شیعری موتەنەبیو سەعدیو "نالی"یان وەك ئاو لەبەربوو، بەڵام نەیان دەزانی حەوت جار حەوت دەكات چەند بەرەو دنیای شیعرو ئەدەبی بردم؟!. بە كورتی بۆم ناچێتە سەریەك بۆچی كە چومە حوجرەی فەقێیان بە جارێك گۆڕاوم و ئاشقە شیعر بوم؟. لە باتی تەسریفی زەنجانیو عەوامیلی جورجانی دەستم بە خوێندنەوەی شیعری خاقانیو قائانی كرد، بەڵام فەرقی شیعری باش و خراپم نەدەكرد. هەر شعیرێك كێشی سوارترو قافیەی گرانتر بوایە بە باشترم دەزانی.

قەدیم لە وڵاتی ئێمەدا كە منداڵیان لەبەر خوێندن دادەنا، لە پێشدا گولستانیان پێدەگوت. دیارە هەر تەقەی سەری دەهات و هیچی لێ تێنەدەگەیشت. بەڵام من كاتێك دەستم بە خوێندنەوەی ئەم كتێبە بەنرخە كرد، كە تەواوێك گەورە ببووم و پلەی خوێندەواریشم تا ڕادەیەك بەرەو ژور چو بو. مامۆستاكەشم زۆر

باشی دەزانیو خۆی پێوە ماندوو دەکردم. خوێندنی گولستان و بوستان دەرکی ئەدەبی فارسییان لێکردمەوە.

لە شازدە، حەڤدە سالێدا دەستم بە شیعر دانان کرد، چونکە زیاتر لەژێر تەئسیری شیعری فارسیدا بووم بە فارسی شیعرم دەگووت. شیعرەکانم کێش و قافیەی تەواویان هەبوو. وشەی شاعیرانەشیان تێدا دەبینرا. بەڵام لاسایی کردنەوەی شیعری شاعیرانی پێشوو بوو، هیچ هەست و عاتیفەیان تێدا نەبوو.

لە منداڵی ناوبانگی چەند شاعیری وەك ناڵیو کوردیو سالم و وەفاییو شێخ ڕەزام بیستبوو، بەڵام نایشارمەوە، شیعری کوردیم زۆر پێخۆش نەبوو گاڵتەشم بە فۆلکلۆر دەکرد، چونکە تا ئەو حەلە زیاتر لە شارو لە حوجرەی فەقێیان بووم، ئەوانەش هەر گاڵتەیان بە گوتەی نەخوێندەوار دەکرد.

ڕووداوێك گۆڕینێکی بەسەردا هێنام. تووشی زاناو ئەدیبێکی گەورە هاتم. مامۆستا "ئەحمەد فەوزی" یان مەلای سلێمانی، خەڵکی ئەم شارە خۆشەویستە بوو، بەم ئاوو هەوا خاوێنە پەروەردە ببوو، نازانم چۆن ئاوارەی وڵاتی ئێمە ببوو، لە کتێبەکەدا نوسیومە:

"دەبێ بڵێم من دەستکردی فەوزیم، ئەو هەڵیوەشاندمەوەو تێکی هەڵشێلام و سەرلەنوێ دروستی کردمەوە، ئەو دەرکی زانین و فێربوونی بۆ کردمەوەو ئەو ڕێگای ژیانی نیشاندام.

بێگومان ئەگەر نەچووبامە خزمەت فەوزیو لە کن ئەو مامۆستایەم نەخوێندبا. ڕێبازی ژیانم ئەو ڕێبازە نەدەبوو کە گرتم و پێیدا ڕۆیشتم و ئێستاش بەرم نەداوە.

ئەو فێری کردم زەوقی ئەدەبیم چۆن تیف تیفە بدەم و مشت و ماڵی بکەم، ئەو فێری کردم چۆن بنوسم و چۆن شیعر بڵێم، ئەو فێری کردم وڵاتەکەم خۆش بوێو پێی هەڵبێم، ئەو حاڵی کردم، کوردی، زمانێکی ڕەوان و بەربڵاوو دەوڵەمەندەو دەکرێ ئەدیبێکی گەورەو دنیاپەسەندی هەبێ.

ئەو حاجی قادر کۆیی، ناڵی، کوردی، سالم، مەولەوی، حەریق، مەحویو ئەدەب و وەفاییو پێناساندم و شیعرەکانی ئەوانی بۆ شیکردمەوە. ئەو فێری ڕۆژنامە خوێندنەوەو ڕۆمان خوێندنەوەی کردم. ئەو دیوانی شاعیرە شۆڕشگێڕەکانی فارسی بۆ پەیداکردم و هانیدام بیانخوێنمەوەو شتیان لێفێربم. بەڵام سوێندی دام قەت بە فارسی شیعر نەڵێم.

منیش ئەو سوێندەم نەشکاند. هەر لەو سەرو بەندەدا کە لە خزمەت فەوزی دەمخوێندەوە، مامۆستایەکی دیکەشم هەبوو کە وشەی ڕەسەنی کوردی فێردەکردم و بەیت و باوی فۆلکلۆری بۆ دەگوتم. "سەید عەولا"ی من زۆر لە دەروێش عەبدوڵڵای مامۆستای (گۆران) کە ئەویشم دیبوو هونەرمەندتر بوو، بەڵام من شاگردێکی ناسوپاس بووم و نەمتوانیوە شیعری بۆ بڵێم.

لە تەمەنی بیست ساڵیەوە بوم بە شاعیر، زیاتر هەست و عاتیفەی خۆم دەخستە نێو شیعرەوە، بەڵام هێشتا دەستم لە گرانترین و بێسوودترین جۆری شیعر واتە تەخمیسی شیعری شاعیرە مەزنەکان هەڵنەگرتبوو. ڕۆژێك ئاوەڵێکم گوتی: دەزانی ئەو تەخمیسانەی تۆ وەك چی دەچن؟

گوتم نا، گوتی: وەك ئەوەی نانی خۆت لەسەر خوانی خەڵك بخۆی!. ئەو ڕەخنەیە وشیاری کردمەوەو دەستم لەو کارە بێسوودە هەڵگرت و ئەو تەخمیسانەی کردبوومن نەمهێشتن، هەرچەند هێندێکیان ناوبانگیان پەیداکردبوو.

یەکەم شیعرم لە گۆڤاری "گەلاوێژ"دا بە ناوێکی موستەعارەوە بڵاکردەوە. شیعرێکی سیاسی ڕێك و پێك و ڕەوانە.

ئەو دەمی زۆر شایی بە خۆبووم کە شیعرم لە گۆڤاراندا چاپ دەکرێ، کەچی ئێستا خۆم لێ بێ ساحێب کردوەو نامەوێ کەس بزانێ ئەو شیعرە هی منە.

ڕۆژێك مامۆستاکە دەفەرموێ: سەرگورشتەو نموونەی شیعری شەش هەزار شاعیری کوردم "الی ماشاالله" کۆکردونەتەوەو خەریکم چاپی بکەم، ئەو بەشەی کتێبەکەی پێنیشندام کە لە بارەی شیعرەکانی موکریانەوە دواوە، دیتم شیعرەکەی بە تەواوی وەرگرتوەو چەند دێڕێکیشی لەسەر بیری بەرزو زمانی پاراوو خەبات و تێکۆشانی شاعیر نوسیوە، بەڵام مێژووی لە دایك بوونیو مردنی نەنوسیوە.

بە مامۆستام نەگوت ئەوە منم تا شەش هەزارەکە نەبێ بە 5999!!.

دوەم شیعرم لە ژمارە (2)ی گۆڤاری "نیشتمان"دا نزیکەی (33) ساڵ پێش چاپ کراوەو لە لاپەڕە (52)ی (تاریك و ڕوون)دا دوبارە چاپ کراوەتەوە.

تەنیا شتێك کە لە شیعرەکانی ئێستامی هەڵداوێرێ خۆ هەڵکێشانێکی لاوانەو ڕۆشنبیرانەیە، بە کچە کوردێك دەڵێم، وەك ژاندارەکی فەرانسەیی ڕاپەڕە. ویستومە بە خەڵك نیشاندەم کە ئاگام لە مێژووی ڕۆژئاواش هەیە!!

دەنا هێنانی ناوی ژاندارەکی هیچ جێگای نییە!.

هەرچەندە لە شیعرەکانی پێشوودا سۆزی شاعیرانەو خەمناکانە تا ڕادەیەك بەدیدەکرێ، بەڵام ئەو سۆزە لە پاش ساڵی 1947 کە توندترین زەبرم لێدرا گەورەترین موسیبەتم بەسەردا هات لەتیفترو گەرمترو شاعیرانەتر کەوتە نێو شیعرمەوە. لە "بابردەڵە"دا کە ئەو ساڵ لە وڵاتی غەریبی گوتومە: وا لەگەڵ بولبول دەدویێم،

بە غەریبی گوتومە:

منیش ئەی بولبولی شەیدا وەک تۆم
وەها دورم لە هێلانەو گوڵی خۆم
منیش وەک تۆ لە کیسم چوو گوڵی سور
منیش هێلانەکەم لێکراوە خاپور
منیش بابردەڵەی بەر گوێژەڵووکەم
دەمێک لەو قولکە تاوێک لەو چلوکەم

لە ئامێزی گەرم بێبەش کراوم
وەکو تۆ توشی ڕۆژی ڕەش کراوم
ژیانم پڕ لە ڕەنجەو دەردو داخە
ئەوا گیرسامەوە لەو کێوو شاخە
کەسێک ناپرسێ، نازانم چۆنم
لە یادان چومەوە، چیرۆکی کۆنم.

ئەو سۆزە لە زۆربەی شیعرەکانی پاش ئەو ساڵەدا هەیە هەر بەتین بوە. لە (فرمێسکی گەش)، گریانی نیوەشەو، خونچەی سیس، بۆسەی ڕۆژگار، تەپڵی ئامان)، بەرەو ژورتر چوە لە (شەوگاری تەنیایی، شەوی شاعیر)دا بە جۆشترەو لە شیعرەکانی پاش ئەوە لە (تاریك و ڕوون)دا، لە (ناڵەی جودایی)دا، لە (سازی ناسازدا) گڕیگرتوە.

لە (فرمێسکی گەش)دا دەڵێم:

نابینی زەردە لەسەر لێوی کەسێ لەم شارەدا
گەر خەم و دەردی دڵی خۆمیان بەسەردا دابەشم
خۆشەویستی گۆشەکەی تەنیایی هەر ئەژنۆکەمە
بۆیە ڕۆژو شەو وەها گرتومەتە نێو باوەشم

لە "گریانی نیوەشەو"دا:

شەوانە گەر نەکەم ئەو شیوەن و ناڵین و گریانە
دەسووتێنێ وجودم ئاگری ئەو جەرگە بریانە

لە "خونچەی سیس"دا، کە یەکێکە لە شیعرە ڕەمزییەکانم لە زمانی بولبولەوە دەڵێم:

ناڵینی من بۆ خونچەیە
بۆ خونچە پەشێوە حاڵم
ئەو داخە لە دڵمدا هەیە
بۆیە هەمیشە دەناڵم
ئەو پێش پشکوتن سیس بوە
بە جوانەمەرگی مردوە

لە "بۆسەی ڕۆژگار"دا:

نیمە ئاواڵێ لە گۆشەی بێکەسیدا غەم نەبێ
چاکە غەم لێرەش وەفای هەر ماوە سایەی کەم نەبێ
لاپەڕەی ژینم هەموو هەڵدەیتەوە تێدا نییە
باسی فرمێسک و هەناسەو شیوەن و ماتەم نەبێ

لە "هێلانەی بەتاڵ"دا.

نییە باکم ئەگەر ڕاوچی شکاندویەتی باڵی من
ئەوە سەختە کە ناگاتە گوێی کەس ناڵەناڵی من

شیعری وام هەن ئەو سۆزەشیان تێدا نییەو بۆ خۆشم لێیان ڕازیم:

من کە ناگاتە هەفتەیەک تەمەنم
بۆچی بگریم و بۆچی پێنەکەنم

* * *

وەبەر من نایەڵێ لێرە مەیو ساقی جەنابی شێخ،
دەنا لەولا شەراب خۆری با هەر بۆ جەفابێ با
هەموو عومری ئەبەد تێدا نییە خۆشی دەمێک مەستی
خدر ئاوی حەیاتی بۆچ بوو، فێری شەرابی با

* * *

بە منداڵی لە لێوی ئاڵی تۆم ئەستاندوە ماچێ
بە پیریش لەزەتی ئەو ماچە شیرینەم لەبیر ناچێ

* * *

پیرو زورهانم و ئێستاش دڵەکەم هەر دەیەوێ
سەرو ماڵم بە فیدای خاڵ و خەت و پەرچەم کەم
داستانی مەم و زین کۆنە، کچێکم گەرەکە
شلکەڕانی بگوشم، بۆنی لە سنگ و مەم کەم

* * *

شیعرێک وەک سێبەری برژانگ
وەکو خەرمانەی دەوری مانگ
ڕێکتر لە گەڕی ڕەشبەڵەک
خۆشتر لە خرمژنی کرمەک
وەک شەراب بگەڕێ لە خوێن
خەم ڕەوێن بێو وشە بزوێن
شیعرێک وەکو دەرییێی بێ بن
گەرمتر لە باوەشی ژن

* * *

هەتا کۆمتر دەبێ پشتم، پتر هەڵدەکشێ مینی جۆب
ئیتر دەستم بە داوێنی کچی ئەم شارە ڕاناگا.

* * *

من لە مێژە غروری ئەدەبیم لە خۆمدا کوشتوەو هیچ بە ئاك و عەیبی نازانم یارمەتی فیکری لە ئاواڵ و دۆستانی خۆم وەرگرم. هەمیشە شیعرو نوسینەکانی خۆم بە دۆستانی لێزانم نیشان دەدەم، ڕەخنەو تێبینی بەجێ بەوپەڕی سوپاسەوە قبوڵ دەکەم و لەو ساڵانەی دواییدا بە تایبەتی زۆرم کەڵك لە هاوکاری دۆستانی شارەزام وەرگرتوە.

تا لە دێ دەژیام شیعرەکانم بۆ لادێییە نەخوێندەوارەکان دەخوێندەوە تا لە باری زمانەوە لێیان دڵنیابم.

یەکێك لە تایبەتەکانی شیعری من ئەوەیە کە نەرم و ڕەق و سۆزی ئەوین و فیکری سیاسی تێکەڵ دەکەم. لە (شەنگەبێری)ی (مەتەرێزی شەرەڵا) و (ئامێزی ژن) و (پەری شیعر) و (یادم بکەن) و (لەبیرم مەکەن) و (بناری هەڵگورد) و تەنانەت (شەوگاری

تەنهایی) و (ناڵەی جودایی)دا ئەم کارەم کردوە، جا، نازانم تا کوێ سەرکەوتوم!!!.

مەسەلەی زمانیش بە گرینگ دەگرم و تێدەکۆشم کام وشە ڕەسەنە بەکاریبێنم. ئەوەی بە ئەرکی سەرشانی خۆم و هەموو ئەدیبێکی کورد دەزانم، بە داخەوە من جگە لە زمانی کوردیو فارسی هیچ زمانێکی تر نازانم.

شارەزاییم لە ئەدەبی دەوڵەمەندی فارسیدا کەم نییەو کاتی خۆی زۆرم شیعری شاعیرەکانی فارسی خوێندۆتەوەو کەڵکم لێوەرگرتوە. شیعری شاعیرە مەزنەکانی خۆشمان دەخوێنمەوەو کارم لێدەکەن، پێم خۆشە شیعرێك بخوێنمەوە کە هەم ڕواڵەتی جوان بێو هەم ناوەڕۆك. بەڵام ئەگەر هەر لایەکیشیان جوان بێ چێژی لێدەکەم، وەك ئەم شیعرەی "نالی" کە هەم ڕوواڵەتی جوانەو هەم ناوەڕۆك:

دەورا نییە وەک هێلەکی سەودا سەری گێژم
بۆیە بە دەقیقی مەسەلە هەرچی دەبێژم
هەر پەرچەم و پیشانییە فکری شەوو ڕۆژم
هەر گەردن و زوڵفە ئەمەلی دوورو درێژم

یان ئەم شیعرەی "شێخ ڕەزا" کە هەر ڕواڵەتی هەیەو قسەیەکی خۆشە:

ویستی لێی ماچێ ڕەزا زاڵمە نەیدایە گوتی
ئەی خوا لەم کوڕە شێخ زادەیە چەند بێ ئەدەبە

بۆ خۆم هەمیشە خەریکم شیعرێك دابنێم هەردوو دیوی جوان بێ، جاری وایە توانیومە تا ڕادەیەك سەرکەوم و جاری واش هیە بە لایەکیان ڕازی بووم. ناتوانم لە پێشدا نەخشە بۆ شیعر بکێشم. کاتێك ئیلهام لە شتێك وەردەگرم و گۆرانی گوتنی خەیاڵێك مەستم دەکاو دەمەوێ بیخەمە چوارچێوەی شیعرێکەوە، ئەوە من نیم چوارچێوە هەڵدەبژێرم، بەڵکو خەیاڵەکەیە کە چوارچێوەو قاڵبی لەبار بۆ خۆی دەدۆزێتەوە. من قسەی بێکێش با زۆر جوان و قووڵیش بێ بە شیعر نازانم.

شیعر دەبێ کێشی هەبێ تا لە پەخشان جودابکرێتەوە جا، قافیەی هەبێ یان نا، هەر بە شیعر دەژمێردرێ.

ڕاستە قافیە شاعیری بێ دەسەڵات و کەم بین دەخاتە تەنگانەوەو دەبێتە بەرهەڵستی دەربڕینی هەست و بیری، بەڵام هەر قافیەش یارمەی شاعیری خاوەن بەهرەو بە دەسەڵات دەدا بۆ دەربڕینی هەستی دەروونی بە وشەی جوانترو شیرینتر، بەکارهێنانی تاقە کێشێك لە پایەی شاعیر کەم ناکاتەوە، بەڵام خوێنەر ماندوو دەکا.

هیچ گومان لە پایەبەرزی مەولەوی ڕۆمیو مەولەوی تاوەگۆزیدا نییە. کەچی من بەش بە حاڵی خۆم هەم لە خوێندنەوەی مەسنەویو هەم لە خوێندنەوەی دیوانی مەولەوی ماندو دەبم.

دیوانی شاعیران وەك باخچەی گوڵاڵەن. گوڵی باخچە تا ڕەنگاوڕەنگتر بێ تەماشاکەران زیاتر ڕازی دەکەن. منیش وەك مامۆستا "گۆران"ی پایەبەرز لەسەر ئەو باوەڕەم کە کێشە خۆماڵیو فۆلکلۆریەکان کە لە باب و باپیرانمانەوە بۆمان بەجێماون، باشتر لەگەڵ تەبیعەتی زمانەکەمان ڕێك دەکەون.

هەر لە منداڵییەوە گوێم بە لایە لایەی دایکی کورد کە لەسەر ئەو کێشانەیە ڕاهاتوەو زمانم بە "هەلوور بەلوور تەکامە" پشکوتوە کە ئێستاش نازانم مانای چیە؟

لە سەرەتای شاعیریشمەوە شیعرم لەسەر کێشی خۆماڵی داناوە: (ئەمەکی گوڵان، بلوێری شوان، ڕۆژگاری ڕەش، بەهاری کوردستان) لە شیعرە کۆنەکانی منن، بەڵام وەك خۆم بە وەزنی عەروزیەوە نەبەستۆتەوە، لە کێشە فۆلکلۆریەکانیشدا گیرم نەخواردوە.

گومانم لەوەدا نییە ئەگەر "شەنگەبێری"م لەسەر وەزنی عەروزی دابنایە ئەو چێژەی نەدەبوو، ئەگەر "گەرمەشین"م لەسەر کێشی بڕگەیی گوتبایە، شینی بێمرادانم بۆ نەدەگێڕدرا. هەروەها ئەگەر "پەری شیعر"م لەسەر وەزنی غەزەلەکانی نالیو سالم گوتبایە سەر نەدەکەوتم و ئەگەر "ناڵەی جودایی"م لەسەر کێشی مەسنەوی مەولەوی نەگوتبایە عالەمێکم لەگەڵ خۆم نەدەهێنا ناڵەو گریان. بە کورتی، من بڕیارم نەداوە لە کام قاڵبدا شیعر بگونجێنم، لە شیعر دەگەڕێم خۆی قاڵب بۆ خۆی بدۆزێتەوەو ئارامی تێدا بگرێ.

ڕەنگە هیچ شاعیرێکی کورد بە زیندوویی سەری، بە ئەندازەی منی لەسەر نەنوسرابێ، پێم وایە ئەگەر "دەزگای هاوکاری" بڵاوی نەکردبایەوە، واتە اعلانی نەکربایە کە هیچی تر لەسەر "تاریك و ڕوون"دا چاپ ناکا، ئێستاش نوسین درێژەی دەبوو. زۆریان پێ هەڵگووتم، مەمنونیان کردم، بەڵام خۆم لێنەگۆڕا. جنێو، بەڵێ جنێویشیان پێدام، بەڵام نائومێد نەبووم. زۆر شت لە ڕەخنەکان فێر بووم، بەڵام شتی سەیریشم هاتە بەرچاو. ڕەخنەگرێك نوسیبووی لە دنیای تەکنیکدا ئیتر شیعری درێژ باوی نەماوەو بێ ڕەحمانە هەرچی شیعری درێژم هەبوو بە هیچی دانابوو. ڕەنگە ڕاست بێو لە وڵاتە سەرمایەدارە پیشەسازیەکاندا کە دراو هەموو شتێکە، کەم کەس وەختی هەبێ نەك شیعری درێژ، بەڵکو شیعر هەر بخوێنێتەوە، بەڵام لە وڵاتە پێشکەوتوەکاندا کە وەختی کار دیارکراوەو ساڵ بە ساڵ لە کورتی دەدا، وەخت بۆ خوێندنەوەی شیعری درێژ زۆرە. لە وڵاتەکانی دنیای سێیەمیشدا کام شیعری من زۆر درێژە وەختی دەستێك دۆمینە ناگرێ. سەیر ئەوەیە لەو سەروبەندەدا کە ئەو ڕەخنەیە بڵاوبۆوە نامەیەکم لە لایەن دۆستێکمەوە پێگەیشت، کە لە وڵاتێکی هەرە بۆرژوازیدا دەژیو هەم دەخوێنێو هەم کاریش دەکا. نازانم ڕاستی کردبو یان نا، سوێندی خواردبوو کە سێ جاری "تاریك و ڕوون" خوێندۆتەوە..

چونکە خەڵکی لادێیە، زیاتر ئەو شیعرانەی بە دڵ بوو، کە لەسەر ژیانی لادێ گوتراون. "ئارەق و تین"ی بە باشترین شیعری من دانابوو، نوسیبووی، تا ئێستا شیعری وەك ئەم شیعرانەم نەخوێندۆتەوە:

من جوتیارم، من جوتیارم
من لەگەڵ هەتاو، هاوکارم
من بە ئارەق و ئەو بە تین
دامانڕشتوە، بناغەی ژین
باسکی من و تیشکی ئەوی
بژێو دەستێنین لە زەوی
گەر جوتیار ئارەق نەڕێژێ
گەر هەتاو تیشک نەهاوێژێ
دانیشتووی ناو کۆشک و قەڵا
دەخۆن نانی گەڵاگەڵا؟

"ئارەق و تین" شیعرێکی ئاماڵ درێژی منە.

ڕەخنەگری ئێمە بە تاوانی درێژبوونی ڕەتی کردۆتەوەو لاوێکی کوردیش کە لە وڵاتی ئیمپریالیستی دەژی بە باشترین شیعری دەزانێ. کارم بەوەدا نەماوە قسەی کامیان ڕاستە. لەگەڵ ڕەخنەگری ئێرەم شیعر تا کورت بێ باشترە، بەڵام ئایا کورتیو درێژی شیعر بە دەست شاعیرە؟!. بێگومان نا! شاعیر دەبێ کوڵ و کۆی هەستی خۆی بڕێژێ. جا ئەو کوڵ و کۆیەی زوو بۆ دەڕژێ یان درەنگ بە دەست خۆی نییە. سیو پێنج ساڵێك لەمەوبەر دەستی کچە کوردێکم لە کەلەپچەدا دی، کە لە دڵی خۆمدا خۆشم دەویست، بێدادیو ئەوین هانیاندام ئەم ڕوداوە بخەمە نێو چوارچێوەی شیعرەوە. خۆم لام وابوو بە هەزار شیعر ناتوانم هەستی خۆم دەربڕم، کەچی ئەو گرە بە ئەم چینە نەك هەر لە کوردەواریدا توانیم دەربڕم.

ئەسیری بسکی کچە کوردێکی نەشمیلم
تەماشاکەن، چ سەیرێکە بە دەستی دیلەوە دیلم

بەڵام ئێستا "ناڵەی جودایی"م پێ ناتەواوەو دەزانم کوڵ و کۆی دەروونی خۆم نەڕشتوە.

ئیلهامی شیعر بۆ من وەخت و ناوەختی نییە. جاری وایە بەڕێدا دەڕۆم، یان سواری پاس بووم و شیعرم بۆ دێ. زۆر جار لەنێو جێدا شیعرم بۆ هاتوە کە نەمتوانیوە بینوسمەوەو لە بیرم چۆتەوە، بەڵام زیاتر لە بێدەنگیو تاریکی نیوە شەودا خوڵقاون.

مرۆڤ هەرچەند بژیو هەرچەند فێربێ هێشتا هەر کەم فێربوەو زۆر شتی نەزانیوە، وردبونەوە لە شیعری شاعیرێکی کوێر ئەزمونێکی بەنرخی فێرکردم.

لە شیعری ئەو شاعیرەدا وەسفی نەرمی سنگ و گەرمیی هەناسەو بۆنی بسك و شیرینی ماچ و ناسکیی دەمی یارەکەی کراوە، بەڵام باسی چاوی کاڵ و لێوی ئاڵ و کوڵمی سورو کەزی ڕەش نەکراوە. وەسفی شنەی با، هاژەی باران، بۆنی گوڵ و ڕەقیی بەردو تامی میوە هەیە، ئەمما باسی شەپۆلی ڕوبار، بەرزی چیا، ڕەنگی گوڵاڵەو زەردی خەزان نییە. زۆر بە ئاسانی دەردەکەوێ کە شاعیر ناتوانێ ئەوەی هەستی پێ نەکا بیکاتە شیعر.

گۆرانی مەزن، وەسفێکی چیاکانی هەورامانی کردوە، لە ترۆپکە هەرە بەرزکەکانی ئەو چیایانە بەرزترە، بەڵام کاتی بەر تریفەی مانگەشەوی لە دەریای بێ سنور لا جوانترە.

لامارتین، وەسفێکی دەریا دەکا کە بێگومان بە زمانی فەرانسە لە شەپۆلی دەریا بە تەوژم ترە، کەچی کانی بەر تریفەی مانگە شەوی بە بەرچاودا نایە.

هەر دولاش هەقی خۆیانە. نە ئەم لە لێواری دەریا ژیاوەو نە ئەو لە بناری چیا. کەوابوو، شاعیر هەر لەو شتانە ئیلهام وەردەگرێ کە لە دەوروبەری هەن، دەیانبینێ یان هەستیان پێدەکا، لە نێوانیاندا دەژی.

ئەزمونی شاعیریش لە شیعرێکدا زۆر دیارە. ئەمرۆژانە من خەریکی بەراوردکردنی "شیرین و خوسرەوی" خانای قوبادی "خسرو شیرین"ی نیزامیم. یا ڕاستەکەی بڵێم خەریکم لەژێر سێبەری فارسیەکەدا شێوەی کوردی گۆران بزانم. لە وەسفی شەوێکی مەستی خوسرەودا بۆم دەرکەوت کە خانای کوردی دۆنەدیو تا ئەو دەمەی ئەو شیعرەی گوتوە قەت دەمی لە شەراب نەداوەو شێخی نیزامی هاونشینی شاو شازادە نشینان زۆر جار لەبەر سەرخۆشی بە کۆڵێ بردۆتەوە ماڵ.

زۆرم سەریەشاندن، زۆرم "من من" بە زاردا هات کە قسەی نەزان و خۆپەرستانە، بەڵام ئەگەر نەزانیش بم، خۆپەرست نیم و، باسەکە ئەوەی هەڵدەگرت، هیوادارم لێم ببورن.

دیسان لە کانگای دڵمەوە سوپاستان دەکەم و خۆشیتان بە ئاوات دەخوازم.

**تێبینی:**
**لە کۆڕێکی ئەدەبیدا لە سلێمانی ئەم باسە لە لایەن مامۆستا – هێمن– خوێنرایەوە.**

**سەرچاوە:**
**هەواری خاڵی، چەپکێ لە پەخشانەکانی مامۆستا هێمن، بەغداد، چاپی یەکەم– 1970.**

# کورتەی ئۆدیسە

"شاری ئەستەم و شورەداری (تراودا) پاش گەلێ قەڵاداریو دەستەوەکەریو بەرگریو شەڕو خوێنڕێژیو قات و قڕی بەدەس یۆنانیان دەگیریۆ بە جارێکی خاپورو تەخت دەکرێ. پاڵەوانانی گەمارۆدەر، هێرش بەرانی کۆنەڵەدەرو دلێرانی نەبەزیو سەرخۆش لە بادەی ئازایەتیو زاڵبوون دەگەڕێنەوە بۆ نێو ماڵ و کەس و کارو خاوو خێزانی خۆیان. لەو نێوەدا تەنیا "ئۆلیس"ی سەر بزێوی چاو نەترسی ئازای پاشای دلێری "ئاتاك" لە ترسی هەڕەشەی "نپتون" خودای دەریاکان هەڵوەدا دەبێ. "پنلۆپ" ژنی جوان و چەلەنگ و ڕۆڵە تاقانەکەی تلماك چاوەنۆڕنی، بەڵام چ سەرو سۆراغی نییە. ساڵ و مانگ تێپەڕین کەچی ئەو هەر بێ سەرو شوێنە. دوژمنانی "ئۆلیس" و گیرۆدەکانی "پنلۆپ" دەرفەتیان هێناوەو مرخیان لەو نازدارە شۆخ و شەنگە خۆش کردوەو هەر یەکە خەریکن بە جۆرێك ئەم ژنە جوانە بەدەس بگرن، بەڵام "پنلۆپ" ژیرانە هەر کامە بە چەشنێ تەفرەدەداو بۆ گەڕانەوەی شوکەی ڕۆژ ئەژمێری دەکا. لە لایەکی دیکەوە بە یارمەتی "منێرڤا" خودای ئاقڵ کوڕەکەی وەدوای مێردەکەی خستوە". گێژاوی توندو تیژو بێبەزەیی دەریا جارێکی دیکەش پەلاماری شێتانەی بردە سەر کەشتی سەرگەردان و بێ پەنای "ئۆلیس" و پێش ئەوەی کەشتیەوانەکان وەخۆ کەون و چارەیەك بدۆزنەوە، کەشتیەکەیان لە بەستێنی "ئۆژیژی" لە قوڕ دەنیشێ و لەبەر یەك دەچێ. ئەم دورگە بنکەی ژنە جادووگەرێکی زۆر جوان بوو کە ناوی "کالیسپو" بوو. هەر لە یەکەم نیگادا دڵی چوە سەر "ئۆلیس" و، ویستی دەستی دەگەڵ تێکەڵ بکاو دەگەڵی بمێنێتەوە، بەڵام سەرداری مەزن دڵی لە جێگایەکی تر بوو ئاواتی گەڕانەوە بۆ نیشتمانی خۆشەویست و دیتنەوەی ژنە وەفادارەکەیو ڕۆڵە تاقانەکەی وەك ئاگرێکی بەتین دەیتواندەوە. بۆیە ڕووی نەدایەو خۆی تێنەگەیاند. جادووگەریش بە رقدا چوو و سوێندی خوارد تا دەمرێ لەم دورگەدا زیندانیو دەس بەسەری بکا. ئۆلیس ماوەی هەشت ساڵ لەم دورگەدا دەس بەسەر بوو، ڕۆژانە لە کەنار دەریا لەسەر گاشەیەك دادەنیشت و فرمێسکی دەڕشت و بە خەمناکی لە ئاسۆ ڕادەما. پەرێشانیو داماوی گەیبوە ڕادەیەك، کە خودایان هەموویان بەزەییان پێدا دەهات، بەڵام "نپتون" خودای دڵڕەق و ڕق ئەستوری دەریا بلێسەی قینی دانەدەمرکا. ئاخر ئەو چۆن لە کەسێکی سەر بزێوو یاخیو نەترس دەبورا کە خۆی لە ئەو بە کەمترو نزم تر نەدەزانی.

ڕۆژێك منێرڤا خودای ئاقڵ، ئاگادار بوو "نپتون" سەفەرێکی دوورو درێژی لە پێشدایەو وا زوو ناگەڕێتەوە. بە هەلی زانیو "ئۆلیس"ی سواری تەختەیەك کردو ناردیەوە بۆ وڵاتی خۆی، بەڵام بۆ بەدبەختی "نپتون" ئەوەندەی پێنەچوو گەڕایەوە، کە ئەوەی بینی لە داخان چاوی چوە پشتەسەر. یەك بە خۆی نەڕاندیو فەرمانی بە گەواڵە هەورەکاندا پاڵ وێك بدەن و شۆڕانە بەربدەنەوەو یارمەتی لە گژەباو گێژەڵوکە وەربگرن و بەم جۆرە فەرتەنەیەکی نایەوە کە بەچاو تروکانێك تەختەی "ئۆلیس"ی لێقەوماوی وردو خاش کرد. "ئۆلیس"ی کوێن دەبەر کەوتە نێو نێرینەی دەریای بێئەمان و وەپەلەقاژە کەوت، بەڵام لەو کاتەدا "ئینو" پەری دەریایی بە چاوی نەنگاوت و زگی پێ سوتاو بزگوڕێکی لە ڕووپۆشەکەی خۆی دڕاندو گوتی: "لەنێو قەدی ببەستە دەتگەیەنمە وشکایی. "ئۆلیس" کە لە سەرەمەرگدا بوو بە قسەی کردو بورایەوەو ئاگای لە خۆی نەما. کاتێ وەهۆش هاتەوە خۆی لە بەستێنی دورگەی هۆزی "فیناس" بینی. ئەمشەوە "نازیکا" کچی فەرمانڕەوای فیناس خودای خودایانی خۆیانی لەخەو بینی کە فەرمانی پێدا بەیانی زوو هەستێ جلی باوك و براکانی بەرێ لە دەریا بیشوا. بەیانی دایکی چێشتێکی باشی بۆ دروست کردو گۆزەیەکی شەرابی کۆن و دەفرێکی پڕ زەیتونی دایەو خزمەتکاری دەگەڵ ناردن بۆ کەناری دەریا. کچەکان تازە لەسەر لمی کەناری دەریا دەستیان کرد بوو بە یاریو گەمەو گاڵتەو گەپ کە لە پەنا گابەردێك پیاوێکی شپرزەو بریندار، بەڵام کەڵەپیاوو بە شان و باهۆو بە دارو بار وەدەرکەوت. کچەکان هەموویان زیڕاندیان و ڕایانکردو خۆیان شاردەوە، بەڵام (نازیکا) بە پیریەوە چوو ماندوونەبونی لێکرد. "ئۆلیس" بە کورتی بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕاوە. (نازیکا) نان و شەراب و چێشتی بۆ دانا تا تێرو پڕی خواردو ئاهێکی هاتەوە. پاشان دەستی گرت و بردی بۆ کن باوکی "ئالینوس". فەرمانڕەوای پیرو دنیادیدە زۆر بەخێرهاتنی کردو گەلێکی حورمەت گرت و پێشوازێکی پیاوانەی لێکردو بە وردی لە حاڵی پرسی. ڕۆژێك پاش حەسانەوە "ئۆلیس" لەلای فەرمانڕەوای زۆرهان و نیزیکانی دانیشت و سەرگورشتەی خۆی لە هەوەڵەوە تا دوایی بۆ گێڕانەوەو گوتی:

"من ناوم "ئۆلیس"ەو کوڕی "لائرنس" و پاتشای ئاتاکم. لە سەرانسەری یۆنان

کەس نییە مـن نەناسـێ و ناوبـانگی ئازایەتی منی نەبیستبێ و لە هێزی بسکی مـن نەترسـێ. مـن لـە هـەردی دەچـووم و گەیشتمە ئاسمان و بۆیەش خودایان لێم تـوڕە بـوون و ڕقیـان لێهـەڵگرتم. کـاتێك گـەماڕۆی "تـراودا" تـەواو بـوو مـن لەشـکرەکەی خـۆم گـێڕاوەو ڕووم لـە زێدەکەی خۆم کردەوە، بەڵام هەر لە یەکەم ڕۆژدا دەریا بە گژماندا هات. چوار شەوو ڕۆژ ئێمـەی وەك زلەکایـەك خسـتە بـەر شەپۆلە بێئامانەکەی خۆی. ڕۆژی پێنجەم شەپۆلەکان هێور بوونەوە. خۆمان گەیاندە دورگەیەك کە ئی هۆزی "سیکون" بوو. لە پێشدا ئێمە هێرشمان بردە سەر ئەو هێزە وەحشـیەو تـالانێکی باشمـان وەگـیر کەوت، بەڵام بەیانی کوڕە کوڕەی هۆزەکە لێمان وەخۆ کەوتن و پێش ئەوەی خۆمان ڕزگـار بکـەین. کوشـتارێکی زۆریـان لێکردیـن. کـاتێك کەشـتی مـەزنی ئێمـە کەوتەڕێ هەوا ئارام بوو. هـەتاوی بەتین و گەرم تیشکی زێڕینەو جوانی خۆی بەسەر دەریـای هێمـن و شـیندا بـڵاو دەکـردەوەو چاو لە دیتنی تێر نەدەبوو، بەڵام هێنـدەی پێنـەچوو هـەوا تـوش بـوو، بـاوو تۆفـان گێژەنیان نایـەوە. پـاش نـۆ ڕۆژ بـەرەنگار بوون دەگەڵ مـەرگ و خـەباتی ئازایانـە لـە بەسـتێنی دورگـەی "کنـارخۆران" لەنگـەرمان گـرت. لـەم دورگـەدا هـۆزی "کنـارخۆران" دەژیـن. بەشـێکی ئێمـە دابەزین و چوونـە ئـاوەدانی بـەڵکو نـان و ئاوێك پـەیدا بکـەن. ئەوان لە وێنـدەرێ بـە خواردنی میوەیەکی شیرین کە پێی دەڵێن "کنـار" سـەرخۆش و گێژبـوون و لـە بیرەخەو ڕاچوون و هێزی ئەوەیان نەما لە جێگـای خۆیـان بـبزوون. بـە زۆرەملـێ و پاڵەپەستۆ بردماننەوە نێو کەشتی. بە پەلە دوورکەوتینـەوە نـەوەکو لـەو میـوە خەوهێنـە بخۆیـن و هـەتا هەتایـە لـەوێ دایکوتـین. سـەفەری ئێمـە لـە دەریـای تۆفـانیدا هـەروا درێـژەی هـەبوو. تـا گەیشتینە وڵاتی "سکلۆپ" یا سەرزەمینی غولانی یەکچاو. لەوێ لەنگەرمان گـرت و دەگـەڵ دوازدە هـاوڕێ بـۆ پـەیدا کردنـی تێشـوی ڕێگـا بـە هـەورازەکانی دورگـە هەڵگەڕاین. لەوێ توشی ئەشکەوتێکی زۆر گەورە بوین کە بە ڕیز مەشکەشیر، پێستە پـەنیر، خیگـە کـەرەو هـیزە ڕۆنـی لێداندرابوون. لـە خۆشـییان شاگەشـکە بوویـن و جێژنمـان کـردو چـاوەنۆڕی خانەخوێی مـەزن بوویـن تـا بگەڕێتـەوەو ئازووخەیـەکی زۆری لێبسـتێنین. کـە ڕۆژئـاوا بـوو پیـاوێکی زەبـەلاح و یـەکجار درێو کە تەنیا چاوێکی لەنێوچاوان بوو دەگـەڵ ڕانێـك مـەڕ هاتنـەوە ئەشـکەوت. پەزەکان هەموویان لە خۆی قەڵەوتر بوون. کە چاوی بە ئێمە کەوت بە دەنگێکی وەك هەورە تریشقە ئێمەی لەرزاند پرسی: ئەی بێگانـە کێـن؟ لـەکوێوە هـاتوون؟ لـێرە چ دەکەن؟ ئێمە هێمنانە جوابمان داوە:

—ئەی خانە خوێی مەزن ئێمە پۆلێك لە شەڕکەرەکانی یۆنانین لە شەڕی "تراودا" دەگەڕێینـەوە. چـەند حـەوتوە ڕێگامـان لێ گۆڕاوە. ئێستاش بەناوی (زئوس) پەنامان بۆ تۆ هێناوە کە ئەمشەو پەنامان بدەی و بەیانی کـەمێکمان ئازووخـە پێببەخشـی و بەڕێمان بفەرمووی.

بەڵام وەڵامی بە ڕەقەوەی ئەو ئەمە بوو:

—چارە ڕەشینە ئێوە بە هەڵە چوون کە پێتانوایـە ئێمـە بـەندەی زئوسـین. خـوای ئێمـە نپتونـە. ئـەوجار دەسـتی بـردو بـەردێکی یـەکجار گـەورەی بـە دەرکـی ئەشکەوتەکەوە نـا پاشـان دوو کەسـی لـە ئێمە هەڵبژاردن و بە هاسانی پچڕ پچڕی کردن و لە پێش چاوی ئێمە بە ئیشتیاوە خواردنیو پێکەنیو گوتی:

شـیوی ئەمشـەو نـاخۆش نـەبوو، بـە پێخور ئەوانی دیکەشـتان دەخـۆم. دوایـە لەسـەر لودەگایـەك کـە لـە قوژبنێکـی ئەشـکەوتەکە هـەڵدرابۆوە لەسـەر گـازی پشتی ڕاکشاو خرپ خـەوی لێکـەوت. لـە پێشدا ئارەقەیەکی ساردم ڕێنیشت، بەڵام دوایـە غـیرەتم بـزوت و ئـاگری تورەیـی هـەموو لەشـی داگـرتم و مـووم لێبوونـە نەشتەر. بریارمدا شیرە کەم هەڵکێشم و بە هەموو هێزی خۆم لەسەر دڵی کوتم، بەڵام پاشان بیرم کردەوە ئەگەر ئەو بکوژم دەبێ هـەتا هەتایە لەم ئەشـکەوتەدا بنێژرێـین و برزێین، چونکە دەمزانی جگە لە ئەو کەس ناتوانێ ئـەو بـەردە لـە زارکـی ئەشـکەوت بکاتـەوە. بـەیانی زوو هەستا ئاگری‌کردەوە.

پەزەکانی دۆشین و دیسان دوو کەسی ئێمـەی برژانـدن. دەم و لەوسـی لسـتەوەو مەڕەکانی بردە لەوەڕو بەردەکەی بە زاری ئەشـکەوتەوە نـا. ئـەو ڕۆژی هـەر ئـەوەندەمان پێکـرا شـینی دۆستانمان بگێڕین.

پاش زۆر لێکدانەوە بیرێکم بە مێشکدا هـات. لـە قوژبنێکـی ئەشـکەوتەکەدا چۆخمایـەکی زۆر گـەورەی دار زەیتـون هەڵپەسـێردرابوو. دەگـەڵ دۆسـتان بـە زەحمەت نوکمان تیژ کردو لە ئاگرمان نا تا باش داگیرسا. شەوێ کە غولی یەکچاو هاتـەوە چوومـە لای و گۆزەیـەکی شـەرابی کۆن و توندم پێمابوو بۆم بردو، گوتم:

"قوربـان ئـەو دیارییـەت پێشـکەش دەکـەم بـەو مەرجـە بـەرم بـدەی" غـول وەریگـرت و یـەك بـێن بـە سـەریەوە نـاو گوتـی: "شـەرابێکی زۆر بـاش بـوو. ئێسـتا ئـەی بێگانـە نـاوت چییـە؟ تـا من لە بیرم بمێنێ".

گـوتم: "قوربـان نـاوم (هیچکـەس)ە. هەموو دۆستان هەر پێم دەڵێن هیچکەس".

گوتـی: "ئافـەرین هیچکـەس! بـەڵێنت پێـدەدەم تـا هـەموویان نەخۆم ئەتۆ نەخۆم".

شـەراب کـاری خـۆی کـرد، خـاوی کردەوەو گێژ بوو و بە پشتەوەدا کەوت و لە غورابی خەوێ ڕاچوو. ئیتر خۆ گنخاندن پێویست نەبوو. بە یارمەتی شەش کەس لە دۆستان چۆماخی زەیتونمان لە ئاگردا سوور کردەوەو بە هەموو هێزی خۆمان لە تاقە چاوەکـەمان ڕۆکـرد. چـاوی سـووتاو یەك بە خۆی نەڕاندی کێوو چیا دەنگی دایەوەو ئەشکەوت لەرزی. تاوێ پێنەچوو ئـەو غولانـەی لـەم دەورو بـەرە بـوون پەیدابوون. ئێمە هەموو خۆمان شاردەوەو چـاوەنۆڕی چارەنوسـی خۆمـان بوویـن. غولەکان لێیان پرسی:

"چبوە؟ کێ وای لێکردی. ئەو کە لەبەر ئێش و ژان و وەك ماری سەر ئاگر پێچی دەدا لـە وەڵامـدا دەیگـوت: "هیچکـەس"، "هیچکـەس". دۆسـتەکانی وا تێگەیشـتن ئەوە بەڵایەکە (نپتون) بە سەری هێنـاوەو

کارێك له دەس ئەوان نایەو ڕێگای خۆیان گرت و ڕۆیشتن. غولی بریندارو کوڵەوار زارکی ئەشکەوتی کردەوە تا مەڕەکانی بڕۆن و دەستی بە پشتی هەموویاندا دەکێشا تا بزانێ خۆمان لەسەر پشتیان قایم نەکردوە تا بمانگرێو تۆڵەمان لێبکاتەوە، بەڵام ئێمە خۆمان بە بەرزگی بەرانەکاندا هەڵاوەسی بوو ڕزگارمان بوو. مەڕەکانیشمان وەپێش خۆداو خۆمان گەیاندەوە کەشتی. من گاڵتەم پێکردو گوتم من "ئۆدیسە"م پاتشای "ئاتاك"[1]. غولی نیوە مردوو بەردێکی هەڵکەندو پێیدا داین چا بوو دوورتر لە ئاو کەوت دەنا لەوانە بوو کەشتییەکەمان نوقم بکا. لەوێوە بەرەو ماڵ گەڕاینەوە، بەڵام سەفەرەکەمان چەند ڕۆژ لەبەر تۆفان و گێژنە وەدوا کەوت. ڕۆژێك گەیشتینە دورگەیەکی پان و پۆڕ کە زانیمان بنکەی "ئایولوس"ە پاسەوانی بایەکان. کە بەسەرهاتی سەیری خۆمان بۆ گێڕاوە هەمبانەیەکی پڕ لە بای بە من ئەسپارد. گوتی: "بە هێزی خۆم با پێچەوانەکانم تێدا زیندانی کردون تا تۆ بە ئاسودەیی بگەڕێیتەوە ماڵی خۆت، بەڵام بە هیچ بارێك نەکەی زاربێنە زێرینەکەی بکەیتەوە. کە بایەکان بەرەڵا دەبن و ڕەنگبێ پاپۆڕەکەت دەس بەجێ تێکبشکێنن. زۆرمان سوپاس کردو بە تێشوی زۆرەوە بەرەو "ئاتاك، کەوتینە ڕێگا، بەڵام دوو ڕۆژ لە سەفەری ئێمە نەگوزەرابوو کە هاوڕێکانم بیریان کردبۆوە کە (ئایولوس)بێگومان گەنج و گەواهیراتی زۆری داوە بە من و دەبێ بەشی وانیشی لێبدەم. خۆیان پێڕانەگیرابوو و زاربێنەکەیان کردبۆوە. لەپڕ هەوا گۆڕا با هەڵیکردو تۆفان پەیدا بۆوە. دیسان کەشتیەکەمان کەوتە فەرتەنەو هەڵۆی مەرگ بە دەوری سەرماندا گەڕا. بە هەزار (ناری عەلی) توشی دورگەی (سیرسە)ی جادوگەری بەدفەڕ هاتین. لەوێش گوڵمەزی وامان بەسەرهات لە گێڕانەوە نایە. هەرچۆنێك بوو لەو مۆلەکەش ڕزگارمان بوو دوایی گەیشتینە دورگەی "ترزیاس". شوانی مێرخاس زۆر بە ڕووخۆشی دەگەڵمان جولایەوە، بەڵام هاوڕێیەکانم ئەوەندە تامەزرۆ بوون چەند مەڕی ئەویان کوشتبوەوەو خواردبوویان. "هیلوس" خودای هەتاو ئەو ناسوپاسییەی پێخۆش نەبوو و گازندەی لە (زئوس) کردبوو. خودای خودایان بەڵێنیدا بوو تۆڵەیان لێبکاتەوە. بۆیە کاتێك ئەو دورگەمان بەجێهێشت تۆفان کەشتیەکەمانی تێکشکاندو جگە لە من کەس دەرنەچوو. ماوەیەك کە لەنێو شەپۆلەکاندا پەلەقاژەم کرد تا گەیشتمە دورگەی (ئۆژیژی). ماوەی هەشت ساڵ لەوێ زیندانی بووم تا بە تەختەیەك نەجاتم بوو و ئێستە لێرەم.

کاتێك سەرگورشتەی "ئولیس" تەواو بوو هەموو زگیان پێسوتا. پاتشای "فیئاس" کەشتی بۆ ئامادەکردو پیاوی دەگەڵ خستن و ناردیەوە، کە گەیشتە بەسێتن خودای ئەقڵ خۆی گەیاندێو ئاگاداری کرد کە دوژمنانی ئەو ئێستا هەموویان لە کۆشکی ئەون و ئەگەر بە ئاشکرای بچێتەوە لەوانەیە سواری سەری بن و بە خۆڕایی بیکوژن. وا چاکە جلکی هەژاران لەبەربکاو لە پێشدا بچێتە کۆخی کۆنە دۆستەکەی "ئومائوس". "ئولیس" بە قسەی کردو لەوێ لاوێکی جوانچاك و ڕێك و پێکی دیو زانی (تلماك)ی کوڕیەتی. باوك و کوڕ پاش نیزیکەی بیست ساڵ یەکتریان لە ئامێز گرت و ماچ کرد. شەوێ بە جلی شڕەوە چۆوە کۆشکی خۆی. کە لە دەرکێ چوە ژوور سەگە پیرو نەخۆشەکەی ئارکوس کلکە سوتەی لەبەر کرد. سواڵکەرێکی خوێڕی تێگەیشت کە ئەو ڕێبوارە هەژارە جگە لە "ئولیس" کەسی دیکە نییە. دەسبەجێ هەواڵەکەی بە "ئانیتنوس" یەکێك لە ئازایان و داخوازان ڕاگەیاند. ئەو ئەگەرچی بڕوای بە سواڵکەرەکە نەکردبوو، هەستاو چوارپایەکی بە کەیفی خۆی لە تۆقی سەری ڕاکێشا. "ئولیس" تێکهەڵگلاو بە تورەیی هەستاوەو خەریك بوو تا تۆڵەی لێبکاتەوە، بەڵام خودای ئاقل تێی ڕاخوڕی. ناچار لە قوژبنێك خزاو "ئانتینوس" دڵنیا بوو کە کابرا بە هەڵە چوە. لە ژووری تالار هەرا بوو "پنلوپ" کەوانە گەورەکەی "ئولیس"ی بە دەستەوە بوو و دەیگوت:

"دوا هەلتانە ئەوەی توانی کەوانی مێردەکەم بکێشێو تیرێکی پێبپاوێ دەسبەجێ شووی پێدەکەم.!" هەموو بەو پێشنیارە دڵخۆش بوون و بە فیزەوە ئامادە بوون، بەڵام هەرچی تێکۆشان هیچ کام نەیانتوانی کەوان بکێشن. تا لە دوایدا "ئولیس" هاتە پێش. هەموو پێکەنین کە پیرێکی هەژارو زورهان، خەریکە خۆی لەگەڵ ژمارەیەك لاوی بەهێز تاقیبکاتەوە، بەڵام بە پێچەوانەی بۆچوونی ئەوان کەوانی تا ئاخر کێشاو تیرێکی بەهێزی هاویشت. ئەمجار جلە شڕەکەی لەبەر خۆی داڕنیو نەڕاندی: "ئەی خۆپەرستان و زۆرداران ئەوەی لە بەرامبەری ئێوەدا وەستاوە، کەس نییە "ئولیس" نەبێ کە پاش گەلێ ساڵ دەگەڕێتەوە ماڵی خۆیو دەبینێ دۆستانی لە دژی ئەو هەستاون.!" تلماکیش بە بەرگی زێرکفت و ئەندامی ڕێك و پێك هات و لە تەنیشت باوکی ڕاوەستا. "ئولیس" کەوانەکەی دیسان ڕاکێشاو تیرێکی لە ئەوکی "ئانتینوس"داو لە حاڵێکدا جامی زێڕینی بە دەستەوە بوو لە خوێن گەوزی. کە ئەو کوژرا ئەوانی دیکە وەخۆ هاتنەوە، بەڵام هەرچی لە نێزەو شیرو مەتاڵی خۆیان گەڕان نەیاندۆزینەوە، چونکە "تلماك"ی ژیر لێی شاردبوونەوە مێزیان شکاندو کورسیان دەس دایە ڕاماڵیان بۆ ئولیس برد، بەڵام لە بەرامبەر هێزی باهۆو تیری گورچوو بڕی ئەودا توانایان نەبوو. هێندەی پێنەچوو هەموو لە خاك و خوێندا تلانەوە. پاڵەوانی مەزن ژنە خۆشەویستەکەی لە ئامێز گرتەوەو پاش بیست ساڵ ئاوارەیی بەختەوەری ڕووی تێکردنەوە.

**پەراوێز:**

**پاشای "ئاتاك" لە هەموو داستانەکەدا ناوی ئولیسە، کەچی لێرە دەڵێ "ئۆدیسە"؟.**

**سەرچاوە:**

**دڵی شاعیر، چاپی یەکەم، چاپخانەی (علاو) بەغداد،** 1980.

# هەواری خاڵی..!

شەو ڕاشکابوو. موسەجەلەکەمان کاری دەکرد. شریتەکە ئارام ئارام هەڵدەویزندرا. گۆرانییە کوردییە خۆشەکانمان یەك لە دوای یەك دەبیستن.

هەر من و ئەو بووین. کەسی دیکەمان بە دەورەوە نەبوو. پیرە مات و بێدەنگ بوو، چاوە لێڵ و سیسەکانی لێك نابوون، جگەرەکە لەنێو ئەنگوستە ڕەق و تەقەکانی دووکەڵی دەکردو بە خۆڕایی دەسووتا. دەنگی حەسەن زیرەك و خالەقیو مەلا حسێن–مان گوێ لێ بوو.

شریت گەیشتە سەر دەنگی "مامڵێ" کە دەمزانی زۆری پێخۆشە. کەچی لەپڕ وەك گۆزێکیان ئاوی سارد پێدا کردبێ، تێکڕابوو، داچڵەکی، چاوی هەڵبڕی، دەوروبەری خۆی بەسەرکردەوەو بە دەنگێکی نوساوو لەرزۆك کە دەتگوت لە بنەبانی ئەشکەوتەوە دێ گوتی:

"کاکە! بەسە توخواکەی بێدەنگی بکە!"

دەستبەجێ ئەنگوستم لەسەر دوگمەی موسەجەلەکەم ڕاگرت، بەڵام سەرم سوڕماو لە دڵی خۆمدا گوتم:

"یانی چی، بۆ وای بەسەرهات؟ بۆ ڕەنگی بزرکا؟ بۆ بەپۆشکا؟ بۆ تکای لێکردم موسەجەلەکە بکوژێنمەوە؟ خۆ ئەو دۆستی نزیك مامڵێیە. مامڵێی زۆر خۆش دەوێو گۆرانییەکانی گەلێك پێخۆشن!. جاران کە گۆرانییەکانی – مامڵێ–مان لێدەدا سەرتاپای دەبوو بە گوێ، موی لێ نەدەبزووت، دەبوو ئێمەش ورتەمان لە دەم نەتەیەدەر دەنا لێمان تووڕە دەبوو دەیگوت:

"دەنگی زوڵاڵ و ئاسمانی ئەو هونەرمەندە خەمم دەڕەوێنێ، کوڵ و کۆم دادەمرکێنێ.. ئۆخژنم دەخاتە نێو دڵ و دەروون". ئەدی چۆنە ئەمشەو گۆڕاوە؟. بۆ نایەوێ گوێی لە دەنگی ئەو خۆشخوانە مەزنە بێ!.

دومژی توندی لە جگەرەکەدا، دوکەڵی بەزارو تفنکدا هاتەدەر، بە تووڕەیی کوژاندیەوەو، هەڵیپرواند دیسان مات بۆوە. هەناسەیەکی ساردو درێژی هەڵکێشا لێوی کرۆشت دەستی وەبەر چەنەی داو چاوی بێ تروکان لە سووچێکی ژوورەکە بڕی. خەمێکی قووڵ، ئازارێکی بێئامان، دەردێکی گرانی لە سیمایدا بەیدەکرا. وەك پیرە هەڵۆیەکی باڵ وەریوی چەنگ شکاوی لە ڕاو کەوتووم دەهاتە بەرچاو. وێ دەچوو بیر لە ڕۆژانی خۆشی هەڕەتی لاوەتی خۆی بکاتەوە کە تازە بە هیوا نییە بگەڕێتەوە. لەمێژ بوو هاودەم و هاودەنگ بووین، باشم دەزانیو دەناسی ئەو کاتەی کە کوێرە برینەکانی دەکولێتەوەو ناسۆرەکانی تەشەنە بدەنەوە، ئەو ساتەی ژان لە دەروونیدا پەنگ دەخۆنەوە، تووشی ئەو حاڵە دەبێو پێی خۆش نییە بیدوێنن.

جاری وا بەجێم دەهێشت، لێی دەگەڕام بە تەنێ لەنێو خەمەکانیدا بتلێتەوەو خۆی دەرمانێك بۆ دەردەکەی بدۆزێتەوە.

بەڵام ئەمجارە لێم ببوو بە وەسوەسە. نەمزانی بۆ وای بەسەرهات؟. دەمەویست هەرچۆنێ بێ لەو ڕازە بگەم جگەرەیەکم بۆ داگیرساندو دامە دەستی.

بزەیەکی تاڵ لێوە وشك و بەبارەکانی لێك هەڵپچڕین. ئەو بزە غیرەتی لەبەرنام بڵێم:

"مامە گیان، پێم سەیرە ئەوە بۆ لە مامڵێ زیز بووی؟"

"خۆ تۆ جاران مامڵێت بە هونەرمەندێکی گەورە ناودەبردو گۆرانییەکانت زۆر پێخۆش بوون". کەمێك بە تووڕەییەوە گوتی: "من لە مامڵێ زیز نەبووم. بەڵام ئەو تاقە گۆرانییەم پێ خۆش نییە". گوتم "نەکا هەوای گۆرانییەکە نارەسەن بێ؟".

لە بیرم بوو کە لەگەڵ ئەو هەموو ڕێزەی بۆ مامڵێی دادەنێو ڕەخنەشی لێدەگرێو پێی ناخۆشە جارجار هەوای نارەسەن دەڵێ، کە مایەی مۆسیقای بێگانەمان پێوە دیارە.

زۆرجار دەیگوت چونکە مامڵێ خۆشخوانێکی گەورەو بەناوبانگەو دەنگی داخوازی زۆرن و لاوەکان وەدووی کەوتوون، زیاتر لەو کەسانەی ناشیاوانەو نەزانانە ئەو کارەی دەکەن، بەڵام خەڵك پێشوازیان ناکاو زیان لە موزیکی نەتەوایەتیمان دەدا.

گوتی: "کارم بە ڕەسەنیو نارەسەنی هەوایەکەی نەداوە، دەنگی مامڵێم لە هەمو حاڵێکدا پێخۆشە. بەڵام تەعبیرێك لە شیعری سەربەندی گۆرانییەکە هەیە کە

ئـازارم دەداو گـەلێکم ئـازار دەدا" گـوتم "کـام تـەعبیر؟". دەمەویسـت بـە وردبوونـەوە لـە تەعبیرەکـە بدۆزمـەوەو مەتەڵەکـە هـەڵبێنم. گوتـی: "تـەعبیری (گەییمە هەواری خاڵی)".

ئەو تەعبیرە بیرەوەری‌یەکی کۆن و تاڵم دێنێتەوە یاد کە ڕابردنی ڕۆژگارو تاڵ و سـوێری ژیـان تـا ئێسـتا نـەیتوانیوە ژیلەمۆی فەرامۆشی بەسەردا بکا".

هەوداکەم هێندەی دیکـە لێئـاڵۆزبوو. دڵم پتر کەوتە فرت و پرت، خوایە!. دەبێ ئەو چەند وشە ساکارانە چ بیرەوەری‌یـەك بخەنـەوە یـادی ئـەم پـیرە زورهـان و ڕەنجەڕۆیـە کـە لـە ژیـانی درێـژو پـڕ مەترسـی خـۆی‌دا تووشـی کارەسـاتی گەلێك گەورەو گران و ڕوداوی فرە بەسام و تاڵ هاتوەو زۆری ڕەنج و کوێرەوەری‌و ئـاوارەیی‌و دەربـەدەری دیـوە، سـاردو گـەرمی ڕۆژگاری چەشتوەو شـەونخونی کێشاوەو لە گژ بەدکاراندا ڕۆچوەو لەبەر زۆرداراندا نەی‌نواندوەو لە پێناوی ژیاندا زۆر جار تا لێواری گۆڕ ڕۆیشتوە؟.

نـەم دەوێـرا لێی بپرسـم، لـە خـۆم ڕانـەدی بیهاروژێنم، دڵنیا نـەبووم وەڵامـم دەداتـەوە. کەم وابوو پریاسکەی دڵی بۆ کەس بکاتەوەو ڕازەکانی بدرکێنێ. ناچار بێ‌دەنگ بووم و چاوم لـە سـەرو سیمای پیاوانەو پیرانەی بڕی، ئەویش کڕو مات بوو. دیاربوو دنیـای دەروونـی شـەپۆلان دەداو کورەی لە جۆشی هەناوی ئاوریگان داوێ پاش ماوەیەك بێ‌دەنگی شریتەکەم لە دوودا، تـا گۆرانییـەکی تـری مـاملێك دۆزیـەوە، دەنگـم دایـە. پـیرە هۆشـی هاتەوەبـەر خـۆی، سـوورایی خۆشـی‌و شـادی لـە کوڵمـە سـوورو چـرچ و بـێ ڕەنگەکانی‌دا پەیدابوو. بە تاسەوە گوێی بۆ گۆرانییەکە هەڵخست، تا تەواو بوو.

بـە زەردەخەنـەوە گوتـی: "بـرا! تـۆ ئەوەم بۆ لێدە، بزانە پێم خۆشە یان نا!". هەسـتا خـەریك بـوو بـڕوا، بـە ڕوو هـەڵماڵاوی پێشم لێگـرت و گـوتم "پێـت نـەگوتم ئـەو گۆرانییـە چ بیرەوەریـەکت دەخاتەوە یـادو ئـەوەندەت ئـازار دەدا؟". چرژا! لێوی لـەرزین و نێوچـەوانی گـرژ کردو گوتی: "لەو دونیا پان و بەرینـەدا هـەموو کـەس هێندێکـی ڕازی ئـەوتۆ لـە سینەدا هـەن کـە بـۆ نێزیکـترین کەسیان ناگێڕێتـەوەو دەگـەڵ خۆیـان دەباتـە ژێـر گڵ. ئـەو ڕازەی منیش لەوانەیـە کـە تـا ئێسـتا کـەس لێی نەبیسـتووم. تـۆش بـیزانی، چ قـازانجت پێناگـاو نـەیزانی چ زیانت لێناکەوێ".

زانیـم زۆر قـەڵس نییـە بۆیـە گـوتم: "نـازانم بـۆ ئـەوەندەم پێخۆشـە لـەو ڕازە بگەم. بەڵام ئەگەر درکاندنی زیانی بۆ تۆ هـەبێ لـەو ڕازە بگـەم. بـەڵام ئەگـەر درکـاندنی زیـانی بـۆ تـۆ هـەبێ گرنـەت لێناگرم" زۆر تونـد کۆکـی، دەسـتی بـە سـینگەوە گـرت و دانیشـتەوەو گوتـی: "پیـاو وازناهێنـێ، لـە کۆڵـم نابیتـەوە، دەوەرە بۆت بگێڕمـەوە: "ئـەو سـەردەمی من لە تافی لاوەتی‌دا بووم. هێشتا شەڕی دوەمـی جیـهانی نەقـەومابوو دنیـا ئـەو هەموو ئاڵ و گۆڕەی بەسەردا نـەهاتبوو، ژیـان زۆر سـاکارتر بـوو. بـە تایبـەتی وڵاتەکەی ئێمە لە ئێستای پاشکەوتووتر بوو. هیـچ شـارێکی کوردسـتان کارەبـای نەبوو و هێشتا لـە دێـهات، چـرای ڕون و گەرچەك و چۆڵە چرا مـابوون و ئـاگر بـە بەردو ئەستێ هەڵدەکرا. هەرچەند تاك و تـوك ئوتومبێـل بـە ڕێگـا نـاخۆش و ناهـەموارەکاندا ڕادەبـردن، بـەڵام هێشـتا باشـترین مـاڵی سـواری ئەسـپی بـوو. شازدە- حەڤدە ساڵە بووم، کە دەستم لە خوێنـدن هـەڵگرت و چوومـەوە دێ. ئەسپێکی زۆر جوان و باش و تفەنگێکی ڕاوێی دامێ. وەك هـەموو دنیـام هـەبێ وابـوو، زۆرم شـایی بـەخۆبوو. هـەموو ڕۆژێ بەیانی زوو سواردەبووم و بەدەشت و مەزرادا دەگەڕام.

پـاش نیوەڕۆیـانیش دەسـتم دەدایـە تفـەنگ و دەچومـە ڕاو. پـاییز داهـات، کاروبار لە کەمێ‌داو ڕاو خۆشتربوو.

ڕۆژێك پیرە ڕاوکەرێك پێی گوتم، کەو ڕەو دەسـتی پـێ‌کردوە، کـەوێکی زۆری تەرەکەمە لە فلان کێـو کۆبوونەتـەوە کـە هەم ماندوون و هەم نەشارەزا. کوشتنیان هاسانەو ڕاویان خۆشە. ئەگەر زووڵێـان وەخـۆ نەکـەوی، بـەرەو گـەرمێن دەڕۆن و لە کیس دەچن.

بـەیانی دەسـتم دایـە تفـەنگ و لاقـانم وەرێنـاو خـۆم گـەیاندە چیایـێ. ڕاسـتی دەکـرد وەك خـێرو خـۆڵێ کـەوڵی بـوو. هەرچـەن ناشـی بـووم و ڕاوم نـەدەزانی‌و باشم نـەدەنگاوت، دیسـان زۆرم کوشـت. ئێواری ماندوو شەکەت، بەڵام شـادو بـە کەیف و بەرەو ماڵ بوومەوە.

یەکـەم جـار بـوو توورەکـەی ڕاوێـم ئـەوەندەی نێچـیر تێدابـێ لامـدا سـەر کانیـاوێك کـەمێك بحەسێمەوە، تەماشـام کـرد ڕەشمـاڵێکی گـەورە لـە سـەرچاوەی کانییەکە هەڵدراوە. ڕێگام بە بەر دەرکـی تاوڵەکە دابوو. دیتم کیژێکی باڵابـەرزی، بەژن باریکی، گەندومی، کوڵمە سووری، چاوو برۆ ڕەشی زۆر جوان و ڕەزا سووك لەبەر دەرکی ڕاوەستاوە تەشی دەڕێسێ. لێی نیزیك بوومەوە.

بە ڕاستی حەپەسام و پێم لەبەندچون. بـە شـەرمەوە سـڵاوم لێکـرد. لام وابـوو جـوابم ناداتـەوەو خـۆی دەژووری داوێتەوە. کەچی بە روو خۆشـی جوابـی دامـەوە، بـە گـەرمی بەخێرهاتنی کـرم و گوتـی: فـەرموو لادە چامـان سـازە پیاڵەیەك چا بخۆوە.

گـوتم: ڕۆژم لێدرەنگـە، ناگەمەوە، بەزیادبێ.

بـەڵام لـە دڵـی خۆمـدا زۆرم پـێخۆش بوو لادەم و هیچ نەبێ تـاوێك لـە بـەژن و بـاڵاو ڕەنـگ و ڕووی ئـەو کیـژە ناسـك و نازدارو شۆخ و لە بارە بفکرم کە هـەر ئـەو جار چاوم پێکەوتوە. نەم دەزانی خەڵکی

کوێیە؟ کچی کێیە؟ خەریك بوو بڕۆم و تێپەڕم، دەستی کرد بە سوێندان و گوتی:

نابێ بڕۆی. چوومە لای ژوور لەلا مێردانی لێفەیەکی خاوێنی لەسەر لبادان بۆ ڕاخستم. چوە کۆلێنێو هێندەی فوو بە قەننەکەی کرد، کەوڵێك نان و جامێك شیرێژو روون و تاسێك دۆی ترشی ساردی لە پێش دانام.

بۆ خۆشی، شانی وەدیرەگی تاوڵداو بەرامبەرم ڕاوەستا. تا پتری تێدەفکریم زیاتر پێم جوان بوو و زۆرترم خۆش دەویست. دەتگوت چاوەکانی جادویان لێکردووم.

نەمدەتوانی چاوی لێ بتروکێنم. ئەویش چاوی لە من نەدەتروکاندا. گوتم بۆ ڕاوەستاوی؟ دانیشە.

بێ پەروایانە زۆر لە نیزێکم دانیشت. ئەو لە من باو خۆشتر بوو، ڕەنگبوو یەك دوو ساڵ بە تەمەن تر بێ.

ئەو گەورە کچ وبوو و من مێرد منداڵ. دیاربوو لە دڵداریشدا ئەزمونی زیاترە. ورده ورده شەرمم لێشکاو لێمپرسی:

ناوت چیە کچی کێی؟. بە ڕاشکاویو بە دەنگێکی سیحراوی گوتی: ناوم هەمینە. کچی پیاوێکی مەڕداری دەوڵەمەند بوو ماڵیان ڕێگای چوار ڕۆژی کاروانی لێرەوە دوور بوو. بە دوای لەوەڕگەدا گەییونە ئێرەو گوتی بێریم دەگەڵن ناردومنە ئاوردوان. خۆم پێ ڕانەگیرام گوتم: خۆشم دەوێی.

بە نازەوە پێکەنیو گوتی: ئەیەڕۆ! کەنگرو قوماش نابنە ویڵداش! کورتی بیڕمەوە لە ماوەیەکی کورتدا نامۆییمان لە نێواندا نەما. بەڵێنی پێدام هەموو ڕۆژێ پاڵێنی بۆم بێتە بن دارێك کە لەو دیوی چادرەکەیان بوو. هەموو ڕۆژێ بێ نێوبڕ بە بیانووی ڕاو دەچووم، یا باشتر بڵێم دەفڕیم بۆ ژوانگەکەمان و هەموو جاریش کە دەچووم ئەو لەوێندەرێ چاوەنۆڕم بوو. بە هیچ زمانێك ناتوانم خۆشیو شادی ئەو ماوەت بۆ بگێڕمەوە کە پێکەوە ڕامان بوارد. ئەوە نەیەکەم دڵداریم بوەو نە ئاخر دڵداریم.. بەڵام خۆشترین دڵداریم بوە. ڕۆژێکیان بە عادەتی جاران دەستم دایە تفەنگ و لە بەندەن هەڵبووم، هەورازو سەربەرەو ژێرم نەدەزانی، وەك با دەفڕیم، دەمەویست زووتر بگەمە جیژوان، دەمەویست زووتر چاوم بە چاوی هەمین بکەوێتەوە.

دەمەویست لەشە نەرم و نۆڵ و گەرم و گوڕەکەی بە ئامێز بگرم، چاو لە چاوە جوانەکانی ببڕم، لێوە ئاڵەکانی بمژم.

مەمکە تورت و خڕەکانی بگوشم، بۆن بە بسك و کەزیەکانییەوە بکەم، دەمەویست گوێم لە دەنگە ناسك و خۆشەکەی بێو خۆی بە قوربان و سەدەقە بکەم. هەرچەن ڕێگاکەم نێزیك نەبوو، بەڵام زۆرجار زوو خۆم دەگەیاندێ، پشووم سوار دەبوو، هەناسەم بڕکەبوو. چومە بن بەردەکە کەسی لێنەبوو.

دڵم داخورپا. بۆ نەهاتوە؟. بۆ دیارنییە؟. لێم نەتۆرابێ؟ نا. نا. دوێنێ بە خۆشی لێك جوێ بووینەوە.

ئاگام لێبوو تا ئاوابوو، چەند ئاوڕی ئاسکانەی لێدامەوە. باوکی بە کەین و بەینەکانی نەزانی بێ؟.

ئەو پرسیارانەم لە خۆم دەکردو وەڵامێکم بۆ نەدۆزرایەوە. دەتگوت لەسەر پۆلوان دانیشتووم، حەجمینم لێهەڵگیرا.

ئۆقرەم لێبڕا. چیدی خۆم بۆ زەوت نەکرا. بە سینگە خشکە لە بستۆکە ئاوابووم، ئەو دەمی زانیم چم لێقەوماوە!

ڕەشماڵ لە جێی خۆی نەمابوو، گەڕام بۆ جێ هەوارەکەی، و لەوێ دانیشتم. لێت ناشارمەوە تێروپڕ گریام و شینێکی باشم گێڕا. قەت هەمینم نەدیتەوە. نازانم ماوە یان مردوە! ئەگەر مابێ دەبێ ئەویش وەك من پیرو کەنەفت بووبێ! بەڵام هەرگیز فەرامۆشم نەکردوەو ئێستاش هەروەك کچە جوانەکەی ئەودەمیم دێتە پێش چاو. نازانم بە خۆمی بسەلمێنم پیری پیزوی کردبێو گۆڕیبێتی.

سی ساڵ بەسەر ئەو ڕۆژەدا ڕابواردوە. منیش دنیام زۆر قوونەکە کردوەو لە تاڵیو ناخۆشیان ڕاهاتووم و ڕۆژگار خاراندوومی. بەڵام هەرچەند جارێك بەسەر هەواری خاڵیدا کەوتووم بە خۆم نەبوە گریاوم". مامە پیرە هەستا بڕوا، لە خاڵێکدا کە کوڵی ئەو لە ئەوکێ دابوو فرمێسکی لە چاوان قەتیس مابوون، چەند هەنگاوێك ڕۆیشت و ئاوڕێکی لێدامەوەو گوتی:

"بۆیە گوتم ئەو گۆرانییە لێمەدە".

* * *

سەرچاوە: هاواری خاڵی، هەندێ پەخشانی بڵاوکراوەی هێمن، چاپخانەی "الحوادث"ی بغداد،ساڵی 1979.

وێنەی کتێب



خۆش ویستبێ، پیم وانییە بەقەد کوری خۆم خۆش ویستبێ، بەلام ئەو شیعرانەی کە زۆریان بۆنی غەریبی لیدێ هەر ئەو شیعرانەن کە من دەو سالی 74–75 گوتومن،.. ناویرم. بۆچی بەنیو بلیم.. تەنیا موسەکینیکی هەمبوو، ناوەکەی نابەم، کابرایەك بوو، کوردیکی کە پیموایە نەیویرابوو بچیتە شاخی، دەنا کیهە بوو نەچووبیتە شاخی..

—ناوی مەحمود زامدار بوو..

—بەلێ.. وەللاهی.. ئیدی ئەوە تۆ دەیلیی.. دەچووم دەردی دلی خۆم لە کن ئەو کەسەی هەلدەرشت. بەلی مەحمود زۆری زەرەر لە خۆیدا، ئەگەر مەحمودیش لە شاخی بایە شیعری چاتریشم دەکوت.. رۆژێ دەچووم لە کن وی خۆمم دەخافلاند.. ئەو مەلعونە نەیدەهیشت ببیتە شیعر (پیدەکەنێ) یا خاتیرەیەکی خۆشی خۆم و مەحمودت بۆ بگیرمەوە. رۆژیك لە یەکیەتی نوسەرانی کورد دانیشتبووم.. مامۆستا عەبدورەزاق بیماریش لەوێ دانیشتبوو، بۆ خۆیشی لەوێ بوو. سێ چواریك لەو بیمارو، نازانم، زامدارو شتانە لەوێ بوون. ئەو کابرایە دەستیکرد بە کەرنامە خویندنەوەی. دەپیش هەموو شتیکدا گوتی: کەر، گیانلەبەریکی هیمنە.. کورە گوتم، هەتیوە بۆ هەژار نییە، بۆ زامدار نییە (هەموو پیدەکەنن)، ئاخر، بۆ بیمار نییە، بۆ هەر هیمنە..؟! یەکجار زۆر خەجالەت بوو (هەموو پیدەکەنن)..

—بەشیکی زۆری تەجروبەی غەریبیت پیوەندیی بەو ماوەیەوە هەیە کە لە عیراق، یا لە کوردستانی عیراق بووی.. ئیستا ئەو تەجروبەیە چۆن دەبینی؟!

—مولاحەزە بفەرموو، شیعرەکانم تاریخیان هەیە. من ئەو مودەتەی کەلە کوردستان بووم، لەژیر ناپالم و تیزابی دوژمندا بووم، یەك شیعرم نییە کە باسی غەریبی تیدابێ.. مەتەریزی شەرەفم لە شەردا گوتوە، بەلام دەلیم ئاوارە نیم، وا دەزانم لە مالم..، بەلام نارەحەتییەکەی من هەر ئەو وەختەبوو.. ئەگەر تاریخی شیعرەکانم بخوینییەوە، هەر ئەو وەختەیە کە من هەست بە غەریبی دەکەم، کە لە بەغدا بە تەنێ بەجیمابووم..

—کەوابێ ئەم غەریبییە، ئەم غوربەتەی لیرەدا باس دەکرێ، غوربەتی زمانە، یانی پیوەندی بە زمان و فەرهەنگەوە هەیە، فەرهەنگی نەتەوایەتی میللەتێ..

—بەلێ..

—یانی تۆ غەریبیەکەت زیاتر لەوەدا بوو کە لە ولاتیکدا بووی، لە رووی زمانەوە، لە رووی فەرهەنگەوە لییەوە دووری.. وانییە؟!

—بەلێ.. ئەوە کامیلەن وایە.. من کە نیزیك بە.. نازانم دە سال، یا هەشت یا نۆ سال لە بەغدا مام، ویستا ئەوەندە عەرەبی فیر نەبووبووم کە بتوانم ئیحتیاجاتی رۆژانەمی پیرەفع بکەم. دیارە ئەوەش موحتاج نەبووم. راستیەکەی ئەوە بوو کە دەمتوانی هەمیشە ئەوەندە کوردیك پەیداکەم کە ئەگەر قاتیك بکرم ببیتە دیلمانج و بۆم بکرێ.. دەنا پیم وا نییە هیندەش نازیرەك بم کە زمان فیر نەبم.. بەلام.. وەللاهی ئیستیعدادی زوبان فیر بوونیشم کەمە.. ها.. ئەوەت پیبلیم وە دوایە بە راستی من نەمدەویست ئەدەبی عەرەبیش فیر ببم، چونکو تەماشام کردبوو کە قەت نابمە ئەدیبیکی چاکی عەرەب، ئەدەبی عەرەبی، ئەدەبیاتی عەرەبی بخوینمەوە، یا نوسینی عەرەبی بخوینمەوە، مەگەر خەبەریك زۆرم ئیحتیاج پێ بووبێ، خۆمم عەزیەت دابێ، دەنا قەت گۆڤارو شتی وام نەدەخویندەوە. عیللەتیشی ئەوەیە کە بۆ خۆت دەزانی ئەدەبی عەرەبی چەندی زەرەر لە زبانی کوردی داوە. با حەقیقەتیك بلیم، دیارە ئەودەمی من نوسینە کوردییەکانی عیراقم زۆر دەخویندەوە تا لە کوردستان دەبوون، تا دەبیرستان، بە ئیستیلاحی ئیرە دەبیرستان، یا بە ئیستلاحی وێ سانەوی‌و شتی واتان دەخویند، هەموو کوردییەکی خالیس و جوان دەنوسرا. لەگەل دەبوونە دوکتۆر، ماشەئەللا عەرەبیتان فکر دەکردەوەو کوردیتان دەنوسی.وای چ بەدبەختییەك بەسەر زبانی کوردیدا هاتبوو.. ئەو عەرەبی فکر کردنەوە، هەستام بەو کارە (پیدەکەنێ).. یەقوومو بیهازەلعەمەل.. بە راستی زەرەری گەورە داوە.

—با جاریکی دی بیینەوە سەر مەسەلەی دەربەدەری، ئاوارەیی‌و دوور کەوتنەوە لە ولات.. ئایا پیاو دەتوانێ بلێ یەکێ لە هۆیە هەرە سەرەکییەکان لە شیعری تۆدا دەربەدەری و ئاوارە بوونە؟!

—نا، عەرزت دەکەم ئەوە بۆ زەمانیکی مەحدودە. شیعری من ئەگەر غەمناکە، هەموو لەبەر لیقەوماوی، چارەرەشی، بەدبەختی میللەتەکەمە تییدا مونعەکیس بوە، نە ئی خۆم، وەختیکی من لە تەمەنی بیست و دوو سالی دەلیم:

گەرچی توشی رەنجەرۆیی‌و حەسرەت و دەردم ئەمن

باوەر بکەن کورە دەولەمەندیکی زۆر تیرو پرو پاك و خاوین بووم، بەلام میللەتەکەم توشی رەنج و دەردو حەسرەت بوو.. (ئەمن) لیرەدا (هیمن) نییە، (ئەمن) میللەتیکوردە.

—بەلام ناتەوێ ئەوەش بلیی کە جوانترین شیعرت ئەوانەن کە غەریبی پیی گوتوی!!

—با.. نە ئەوە لەبەر وەش بوە کاکە، لەبەر وەی بوە من تەجروبەی شیعرم زۆرتر رۆیوەتە پیشێ.. هەر غەریبی نەبوە، من تەجروبەی شیعریشم زیاتر بوە.. ئەزمونی شیعرم هەتا تەمەنم بەرەو ژوورتر چوە، بەرەو پیشتر چوە.

—ئەی کەواتە سەرچاوەی شیعر، لای تۆ، جگە لەوەی وتمان، کە رەنگە دەربەدەری جوانترین شیعری پیگوتبی، چی دیکەیە؟!

—وەللاهی.. جوانیش زۆری تەئسیر لە من کردوە، جوانی دیارە بە هەموو مەعنای کەلیمەوە، بەلام جوانترین شتیش لە نەزەر مندا ژن بوە، یانی ئینسان بوە، کە دیارە جیسنی



موخالیفە، لە هیچ شیعرێکی مندا، تۆ پێم وایە، بۆنێکی وا ناکەی کەمن تەمایولێکی غەیرە ئینسانیم تێدابووبێ.. بەڵێ.. بەڵێ.. تۆ هەر ناڵەی جودایی دەبینی لە شیعرە غەریبییەکانی مندا، ئەدی.. شیعری وام هەیە کە ناڵەی جوداییش نییە، بەڵام بۆنی غەریبی لێدێ، کە دەڵێم: یادم بکەن. زۆر سەیرە.. بە ڕاستی ئەو شیعرەی من کەم کەوتۆتە بەر لێکۆڵینەوە ئینتیقاد. من پێم وایە لەو شیعرەیدا زۆر شتی نوێم هێناوەتە گۆڕێ، کە لە پێش مندا هیچ شاعیرێکی کورد -لائەقەل- نەیگوتبێ. من دەڵێم:

لەو دەمەیدا گڕ دەگرێ مەیل و تاسە

لەو دەمەیدا تێك هەڵدەنگوون هەناسە

پێم وایە "تێك هەڵدەنگوون هەناسە"، ڕەنگ بێ ئەو تەعبیرە زۆر کەم بێ لە شیعری شاعیرانێ کە من بیانناسم. ئەوەش هەر نەوعێکە لە دەردە غوربەتەکەم.. بەڵێ.. جوانی لە هەموو شتێکی دی.. جوانیش یەکێك بوە لەو شتانە کەمنی هان داوە بۆ شیعر گوتن.. جوانی تەبیعەت.. دیارە پتر لە جوانی تەبیعەت، جوانی ئینسان.. ئینسانی جینسی موخالیف.

–تۆ لێرە باسی تەعبیرت کرد.. لەو دەمەیدا تێك هەڵدەنگوون هەناسە..

–بەڵێ..

–ئەمە ئەگەر بەراوردی بکەی لەگەڵ ئەو دەربڕینە ئیحساساتییەی کە لە ناڵەی جوداییدا باست کردوە، ئەوەیان زۆر بە ئاشکرا پێوە دیارە کە زیاتر شتێکی ئیحساساتییەو ڕەگەزێکی ماددی تێدا بەدی ناکرێ، بەڵام "تێك هەڵدەنگوون هەناسە" شتێکی زیاتر ماددی نیشان دەدا. ئەمە بە ڕەئی تۆ، دوو تەجرەبەی جیاواز نیشان نادا؟!

–با.. با.. بەڵێ.. بەڵێ.. بەڵێ دوو تەجرەبەی جیاوازە. بە عەقیدەی من لێرە مەحرومییەتێکی دیکە نیشان دەدا، لەوێ مەحرومییەتێکی دی. ئیدی پێموایە زۆریش شکافتر نەڵێم.. (پێدەکەنێ).. چونکو هەر ماچی کچە سولەیمانییان تێری نەدەکردم بە تەنیا (پێدەکەنێ).. چونکو باوکانە بوو.. وەکوو عەرزم کردی، ماچیان نەدەدا بە شاعیرە لاوەکان، دەیاندا بە من چونکو پێیان وابوو بێئازارم (پێدەکەنێ). بێئازار نەبام بۆ دەیاندا (پێدەکەنێ).. نازانم تۆ ئەو شیعرەی منت دیوە، کە خەڵك ڕەنگە زۆری فکر لێنەکردبێتەوە:

وەرە ماچم دەیە، ماچی خودایی

کە بێزارم لە ماچی سینەمایی

لێرەدا ماچی سینەمایی ئەو ماچانەن، کە وەکو بابێك ئەو خەڵکە منیان ماچ دەکرد.. پێم وایە ماچی بابانە بوو (پێدەکەنێ) کردوومەتە ماچی سینەمایی..

–جگە لە دەربەدەری. جگە لە خۆشەویستی نیشتمان، دیارە ئافرەتیش ڕۆڵێکی زۆری لە شیعری تۆدا هەیە.. تۆ چۆن سەیری ئافرەت دەکەی.. بەلای تۆوە ئافرەت بۆ شاعیر دەبێ چی بێ؟!

–پرسیارێکی زۆر گرانە، ڕەنگە گوێیان لێبێ (پێدەکەنێ) بەڵام چ بکەم، دەبێ جوابت بدەمەوە. من پێم وا نییە ئافرەتێك بە ڕاستی بۆ ئینسانێك.. یا ژنێك.. من کەلیمەی ئافرەتیشم قبوڵ نییە، لە بیرت نەچێ، پێم وا نییە لە خودای جوانیڕا هاتبێ، پێموایە لە (عەورەت)ی..

–منیش لەم کاغەزەدا هەر دوو وشەکەم نوسیوە..

–بەڵێ.. با توخواکەی ئێمە بڕێك لەسەر وەی بڕۆین.. تۆش لە بیرتە.. کێشەم، زۆر لەسەر وەی بوو، دەمگوت ئافرەت عەورەتە کە لە ئەدەبیاتی فارسیدا فەوقولعادە بەکارهاتوە، بە مانای ژن و منداڵ، بە مانای.. حەرەم.. یەعنی ئەم کەسانەی کە نابێ خەڵك بیانبینێ.. کەوتۆتە زمانی کوردییەوە. لە کوردستانی ئێراندا تەنیا ئەو کەسانەی پێیان عەیبە باسی ژنەکانیان بکەن، ئەوان بانگی دەکەن ئافرەت.. دەنا ئەگەر ناوی ژنەکەی بوێرێ بڵێ: فاتم، ئایش، نازانم.. گوڵێ.. چی.. ناڵێ ئافرەت، ئیدی بانگی ژنەکەی دەکا.

زۆر سەیرە.. ڕۆژێکی دەگەڵ یەکێك لە مامۆستاکان کێشەم بوو. دەیکوت ژن بە مەرحەلەیەك لە ژیانی ئافرەت دەڵێن کە کچێتی نەمێنێ.. گوتم یانی ئەگەر کەسێك بچێتە حەمامی ژنانە، حەتمەن دەبێ کچایەتی نەمابێ (پێکەنین).. یا کابرایەك دەڵێ کەوشی ژنانە دەفرۆشم ئیدی ئەمە هەر دەبێ بە کچی نەفرۆشێ.. نا وا نییە.. ژن کەلیمەیەکی دژی پیاوە. کەوابوو ژن هێندەی کەلیمەکە ناسکە، هێندەش بۆ خۆی لەلای من ناسکە، بەڵام بەو حالەوە بەلای منەوە موحتەرەمە. یانی ئەوەندە بەلای منەوە موحتەرەمە، کە دەگەڵ ئەو هەموو خۆشەویستییەی من دەگەڵ ژنم هەیە، خۆت لە من باشتر دەزانی، یازدە سال من دەربەدەر بووم، ژنێکی دیکەم نەهێنا، چونکو، پیم وابوو ژنێك بۆ ئینسانێك بەسە. دەنا پیت وا نەبوو ئەمن لەو کوردستانی عیراقە پیرێژنێکم وەگیر کەوێ..

–ئەگەر بە (سیغە)ش بوایە..

–(پێدەکەنێ).. ئەگەر بە سیغەش بووبا.. بەلێ..

–ئەوە پاشان دیمەوە سەر ئەو باسە، بەڵام شتێکت باس کرد، کە تۆ وا دیارە ئەوەی خۆتت لەبیر چۆتەوە. ئەو سەرەتا دوروو درێژەی تاریك و روونت نوسیبوو، لە یەك شوینا باسی خێزانەکەی خۆتت بەناو نەکردبوو. دواییش لەسەر ئەوە رەخنەیان لیگرتی..

–بەلێ..

–ئەوە چی بوو..؟!

—عەرزت دەکەم.. من لەو ڕەخنەدا جوابم داوەتەوە، دەڵێم ئەوە پاشماوەی ژیانی چینایەتی بوە کە تەئسیری کردوە لە مندا، وە بە ئیستیلاحی فارسی، نازانم بە کوردی بڵێم چی، (ناخود آگاه) من باسم نەکردوە. دوایە لە مەقالەیەکی بچووکدا مەعزەرەتم خواستوە..

—دەڵی نەچوە بچێ..

—نەچوە بچێ.. بەڵێ.. بەڵێ.. ئەوە پاشماوەی.. جا ئەلعان کە ئەوە لە مندا نەماوە.. ئێستاکە زەمان وایکردوە پێکگەیشتوینەوە، دیسان هەر لە شارێکی غوربەتین ئیدی..

—بەڵێ..

—ئەگەر من جارێکی بمەوێ کۆمەکێکی.. وەکو دەزانم ئەتۆ لە ئەوروپایە بە.. ڕەنگ بێ.. بە ماڵە خۆت بکەی.. ئەگەر من بمەوێ.. ئەو ماڵ دەماڵێ، بڵێم بیدە بە من برێك گەسك لێدەم، ئەو پاشماوەی چینایەتی تێدا ماوە، دەڵی تۆ چۆن کاری ژنانە دەکەی؟! (پێدەکەنێ).. دەنا من پاشماوەی چینایەتیم تێدا نەماوە..

—باشە.. ئەگەر وابێ باشە..

.. بە هەڵسوکەوت لەگەڵ ژندا، با بڵێین بۆ شاعیرێك.. پێتوایە لە ڕێگەی دڵدارییەوە پیاو باشتر ژن دەناسێ، یا ژن هەر وەکو خۆی لە تەبیعەتدا هەیە..

—وەڵڵاهی، کاکە، من وەك کوردێك توشی ژن بووم. بۆ خۆت دەزانی داب و ڕوسومی کوردی، دڵدارییەکی.. دڵدارییەکەش هەر مەحدودە، وەکو ئەو دڵدارییەی کە دەزانم ئەتۆ دەڵێی چی.. وە من بەو شکافتەی بڵێم.. وەڵڵاهی پێموایە، پیاو تەنیا وەختێك دەتوانێ ژن دەرك کا، کە ئیزدیواجی کردبێ، یانی ژنی هەبێ، ئەو دەمی دەتوانێ دەرکی کا.. پێم وا نییە لە دڵداریدا پیاو بتوانێ ئەو تەجروبەی بێتە دەسی وەکو ژنداریێك هەیەتی.. عیشقێك، ئەوینێك یا عیشقێك پایەدارە کە ئەخلاقیشی لەگەڵ بێ. گوایە.. ئەگەر تۆ سەیری دیوانەکانی من بکەی، من لە ساڵی 1325ی هەتاویدا ژنم هێناوە..

—ئەگەر تاریخەکان بە هیی زایینی بڵێی..

..کە دەگەنە.. تەقریبەن چلو شەش، 1946 من ژنم هێناوە. ئەگەر تەماشای تاریخی شیعرەکانم بکەی، شیعرە دڵدارییەکانی من هەموو پاش ژن هێنان گوتراون، ئەوانی کە تام و خوێیەکیان هەیە.

—کەواتە، بۆ کێت گوتون..؟!

—کەوابوو هەر بۆ ئەوەی زۆری شایی بەخۆ دەبێ. قسەکانمان توندە (پێدەکەنێ).. کەوابوو پێم وانییە بۆ شتێکی دیکەم گوتبێ..

—هەندێ بیروڕای جیاواز لە بارەی پێوەندیی ژن و پیاوەوە هەیە: سێکس بەردەوامی دڵدارییە، لوتکەی دڵدارییە، یا دڵدارییە، یا دڵداری لەگەڵ سێکسدا دەمرێ.. تۆ چۆنی دەبینی؟!

—من پێموایە دڵداری لەگەڵ سێکسدا پەروەردە دەبێ و دەڕواتە لای سەرو..—یانی بەلای تۆوە لوتکەیە؟!

—بەلای منەوە، بەڵێ، لوتکەیە.. من زۆرم بڕوا بە عیشقی ئەفلاتونی نییە.

—ئەم جارە لەو گشتییەوە دیمەوە سەر تۆزێ تایبەتیتر، دەربارەی تەجروبەی خۆت. دایکی سەلاح، با بلێین خیزانەکەت بۆ تۆ چی دەگەیەنێ؟! ئەمن ناویم لەبیر نییە..

—ناوی ئاییشە.. بەلێ..

—بەلێ..

—وەڵڵاهی، لە هەموو کەس خۆشەویستترمە لە ژیاندا، بێ ئەولاو ئەولای، با گویشی لی نەبێ..

—بۆ ئەمەیان گویی لی نەبێ.. ها..؟!

—بەلێ گویی لی نەبی، زۆر غورور دەیگرێ (پیدەکەنێ).. با غورور نەیگرێ..، بەڵام بەلای منەوە لە هەموو کەس بۆ من خۆشەویستر بوە لە ژیانمدا.. وە ئەلعانیش تەحەکومیکی کە گالتە بە گیانی خۆم کردوە لە تەواوی ژیانمدا، دەگەڵ زۆر ملهوری گەورەدا موبارەزەم کردوە، خەباتم کردوە، لە موقابیلی ویدا، ئەلعان، زۆر بیدەسەڵاتم. لە حالی حازردا زۆر بیدەستەڵاتم.. بە راستی دەبێ لەسەرم بکەنەوە (پیدەکەنێ)..

—ڕەنگە هەر تۆ وانەبی..

..تەجروبەی تۆ.. نازانم ئیوە چەند ساڵ بوو یەکتان نەبینیبوو؟!

—ئیمە.. پتر لە دە ساڵ و نیو..

—دە ساڵ و نیو..

—بەلێ..

—دەلین کە نازم حیکمەت.. نازم حیکمەتیش تەجروبەیەکی وای هەیە..

—بەلێ..

—دوای، وا بزانم، یانزدە یا دوانزدە سال کە مونەوەری بینییەوە.. ژنەکەی..

—بەلێ..

—هەموو هەر چوار مانگ لەلای مایەوە.. ناردییەوە.. ئیدی نەیشیدییەوە.. تۆ چۆن بووی؟!

—وەڵڵاهی.. من پیم خۆش نییە تازە لیك جوبینەوە.. تا ئەوێ پیی دەلین مەرگ و هادیموللەززات (هادم اللذات) لە یەکمان جوێ نەکاتەوە، پیم خۆش نییە، لیی جوێ ببمەوە، راستییەکەی ئەوەیە، بەڵام بە راستی وەکو من، پاش گەرانەوەشم ئیتر شیعری دلداریم نەگوتوەو هەر مانایشی نەماوە بۆ من، وە ڕەنگ بێ برانی





کەلیماتە. یانی، بە ڕاستی کەلیمەم بۆ جوانی لەدەس چوە. ئیدی هیچم نەماوە پێی بڵێم. ڕەنگە ئەوەش مەسەلەیەك بێ، کە ئیتر من چ بڵێم.. من کەلیمەی کلاسیکم لە بارەی شیعری کوردیدا بێغەڵەتە، بەڵام لە شیعری عەروزیدا ئەوی من لە بارەی ژندا دەڵێم:

به ڕیشی بۆزەوە سوجدەی دەبەم من بۆ جەماڵی تۆ

ئەدی بۆچی دەیانگوت دار کە پیر بوو تازە دانایە

تازە ئیدی تەماشا دەکەم شتی وا لەتیفم نایەتەوە خەیاڵ و لەبەر وەی دەستم لێ هەڵگرتوە.. بە هەزار زەحمەت توانیومە لەو بەینانەدا شیعرێك لەسەر حیجابی ئیسلامی بڵێم، کە پێموایە شیعرێکی خراپ نەبێ، ئەمما لەبەرم نییە ئەلعان بۆت بخوێنمەوە.

—ئەمە پیاو بۆ پرسیارێکی تر ڕادەکێشێ..، بەڵام مەبەستی تۆ خۆت، وەکو مام هێمن، نییە، بەڵکو هەر وەکو شاعیر بە گشتی، ژن هێنان بەلای تۆوە چۆنە، یەعنی شاعیر دەبێ ژن بهێنێ؟!

—وەڵڵاهی، کاکە، ئاخر وەکو عەرزم کردی، من پێم هێندێ کەس، دەگەڕێمەوە بۆ پرسیارەکەی تۆ، هێندێ کەس پێیوایە ئەگەر ژنی هێنا دادەمرکێ، وە هێندێ کەس.. من بۆ خۆم ئەگەر ژنم هێنا بومە شاعیر، بەڵام نازانم خەڵکی دیکە چۆنە؟ تۆ پێت وانییە مامۆستا گۆران پاش وەی دایکی ڕوناکی بوو (دەبێ مەبەستی دایکی هێرۆ بێ، نەك دایکی ڕوناك —ف. ش.) ئیدی شیعری دەبارەی جوانیدا کەم گوتوە؟!

—جوانترین شیعرەکانی ئەوانەن کە لە بەینی ژن هێنانەکانیو دوای ژن هێنانەکانی گوتونی..

—گوتویەتی..

—بەڵێ..

—نازانم، چونکو تاریخیان نییە.. بە داخەوە شیعری مامۆستا گۆران عەیبێکیان هەیە، کە پیاو نازانێ.. بیستومە ژنە عەرەبەکەی زۆر جوان بوە من کە نەمدیوە. پێت وا نییە دامرکابێ پاش وەی ژنە عەرەبەکەی بوە؟!

—وەڵڵاهی، وەك تۆیش باست کرد، نازانم. یانی لەبەرئەوەی تاریخەکەی پێوە نییە، پیاو نازانێ..

—بەڵێ.. بەڵام من شاعیرێك دەناسم، ئەلعان دەتوانم لێرە باسی بکەم، ئەمما پێم خۆش نییە لە زمان منەوە وانێك، ئەوە بگوترێ. بۆ خۆت قسەی لەگەڵ دەکەی. ئەمن پێم وایە مامۆستا هەژار لەگەڵ ژنی هێنا ئیتر شیعری جوانی نەگوت. لەگەڵ ژنی دوەمی هێنا شیعری عاشقانەی جوانی نییە.. بەڵێ، لە بەرەو موکریاندا، کە دوور بۆتەوە، بۆ ماوەیەکی لە براژنم دوور بۆتەوە، برێك شیعری عاشقانەی جوانی تێدا هەیە، کە ئەویش بۆ ماوەیەکی موختەسەر بوە. یا لە بابا هەژاری موکریاندا برێك عاشقانە شیعر دەڵێ، بەڵام تۆ پێت وا نییە زۆریان تەقلیدین؟!

—وایە.. ڕاستە..

—بەڵێ..؟!

ڕاستە، وایە..

—بەڵێ.. وە من لە بیرمە، کە هەژارێکی زۆر منداڵ پێش وەی، ڕەنگ بێ ئەو شیعرانەی لە ئاڵەکۆکدا بڵاوبونەوە، پێش ئەوەی ژن بێنێ دەیتوانی شیعری عاشقانە بڵێ..

چاوت کە گۆشەدارە وەکو ڕۆژی نیشتمان

پەیدا دەکا هەرایەکی لەو کوردەوارییە

ئەوە شیعری زەمانی زۆر منداڵی مام هەژارییە، زۆریش جوانە. ئەوە مەربوتە بە ئەو ڕۆژەی کە لە پشتی گۆڤاری نیشتماندا چاپ دەکرا، تەماشا دەکەی ئەو شیعرەی زۆر جوانە..

—وایە..

—بەڵێ..

—ئەم دوو سێ پرسیارەی دوایی هەستێکی وا بە پیاو دەدات، وەك بڵێی شاعیر، کۆمەڵێ قانون هەیە کە دەیگرێتەوە، یا کۆمەڵێ چوارچێوە هەیە کە تەنیا بۆ شاعیرەو ڕەنگە بۆ خەڵکی تر نەبێ. من بەش بە حاڵی خۆم ئەوەندە باوەڕم بەوە نییە قانونی تایبەتی هەبێ بۆ شاعیر، کە خەڵکی دیکە نەگرێتەوە..

—بەڵێ..

—بەڵام، بەهەر حاڵ، دیسان یەك دوو پرسیاری لەو بابەتەت لێدەکەم. بەلای تۆوە پەیوەندی نێوان شاعیر و ئازادی چییەو.. چۆنە؟! ڕەنگە وا ڕاستتر بێ بڵێین نوسەرو ئازادی، چونکە مەسەلە تەنها شاعیر نییە.. (ئەگەر ئەو پرسیارەم ئەمڕۆ بکردایە دەمگوت هونەرمەندو ئازادی— ف. ش.)

—بە عەقیدەی من.. بەڵێ.. ئەفسوس.. لەوەتی من قەڵەمم بە دەستەوەیە قەت هەستم بە ئازادییەك نەکردوە کە قەڵەمی خۆم بە کەیفی خۆم بەردەم.. پێموایە قەیدو قیودێك هەمیشە هەیە، کە شاعیر یا نوسەر ناتوانێ ئەو ئازادییەی حیسسی دەکا..

هەرچی دەکەم ئەو خەیاڵەی پێی مەستم (لە ڕاستیدا— هەرچەند— ف. ش.) بۆی بێتە سەر کاغەز. سەیرە. ئێوە پێتان وایە شاعیرەکانی غەربی یا ئەوروپایی، نوسەرەکانی غەربیش توانیویانە بەو هەموو ئازادییەی، بەرەڵڵایی، یا.. نازانم چی شیعر بنوسن..؟! ڕەنگ بێ هەموو کەس پیی وابێ ئیعترافاتی ڕۆسۆ زۆر سەریحە، بەڵام تۆ فکر دەکەیەوە ڕۆسۆ، شتی شاردۆتەوە یا نە؟! من پیموایە زۆر شتی شاردۆتەوە.. لە هەموو کەس سەریحتری نوسیوە، بەڵام ئایا شاعیریك ئینسان نییە؟! ئینسانیك جاریك، بلیی ڕۆسۆ، دە عومری خۆیدا جاریکی زگەشۆرەی نەگرتبێ.. تۆ تەواوی ئیعتیرافاتەکەی بخوینەوە، قەت باسی ئەوەی تیدا هەیە..؟! (پیدەکەنێ)..

—جوانە..

—کەوابوو، کاکە بە راستی قەت ئەو ئازادییەی کە ئیدئالە بۆ شاعیرو نوسەر.. بە تایبەتی شەرقی، ئیدی بۆ خۆت دەزانی



شەرق ئەوپەڕی.. بە عەقیدەی من، ئەو ئازادییە، هەڵنەکەوتوە. جا ئەو جار بۆ من پترە، چونکو من..

—لە پێش هەموو شتێکا چونکی کوردم.

—بەڵێ.. لە پێش هەموو شتێکدا چونکو کوردم.. ئەو جارەکانە ماوەیەکی دوورو درێژ من ئەندامی حیزبێك بووم، یانی ماوەیەکی یەکجار زۆر دوورو درێـژ، خـۆت دەزانـی.. ئەوەشـت بـا پێبڵێـم، ئەگەر نەکەوتبامە عێراق، وە چاپەمەنییەکانی عێراق شیعرەکانیان بۆ چاپ نەکردبام و هەر دە مەتبوعاتی حیزبدا چاپ کرابایە، زۆر لـە شـیعرەکانم دەفـەوتان. مـن ناڵـەی جودایـیم دەدا بـە ئۆرگـانی حیزبەکەمان، دەیگوت بە من چ مەربوتە تۆ مەشروب دەخۆیەوە یا نە.. (هەموو پێدەکەنن).. وە ڕەنگ بێ لە ناڵەی جودایی چاتر من شـیعرێکم هەیـە بـە نێـوی (سـوڕی دەوران)، بـە ڕاسـتی هــەر لــە ناڵەی..

—..ناڵەی جوداییدایە..

—تێیدایە..

—بەڵێ..

—.. من لەوێدا پێشبینی ڕوخانی شام کردوە. دوو سێ ساڵ پێش ڕوخان.. پێم وابوو..

بە ئەفسانەی دەزانن سوڕی دەوران
غولام و ورتکە خۆری دەرکی گەوران
بەڵام ڕۆژێک دەبێ دەوران بدا سوڕ
لەبەر گەوران نەبێ پشتی خەڵک کووڕ

—ببوورە.. پێش ئەوەی بچمە سەر پرسیارەکەی تر..

—بەڵێ.. من لەوێدا زۆر..

—.. بۆچی پێشت وایە ئەمە پێشبینییە؟! خۆر هەر زۆر کەس وای گوتوەو واش دەڵێ کە زۆرداری نامێنێ، هەر دەبێ بڕوخێو.. یـانی بـوە بـە قسـەیەکی کـە هــەموو کــەس دەیڵــێ.. هــەموو پێدەکەنن)..

—وەڵڵا.. ئەلعان ئەوەیە، ئیدی.. من حەیاتم داوەتێ، خەڵکی دیکـە.. ئـی خـەڵکی دیکـە بـا بردویـەتی.. (پێدەکـەنێ).. بـەڵێ، ڕاستە.. ئەوە مەسەلەیەکی دیکەیە، بەڵام من دەمزانی، کە زۆردار هەر دەڕوخێ.. بە ڕاستی هێندە نیزیکیشم پێشبینی نەکردبوو.. ئەم ڕۆژانە برایەکی عێراقیم دی، گوتی ئەتۆ وەسیەتنامەیەکت لە کن خوشکەکەی من هەیـە، کـە وەسـیەتت کـردوە، نوسـیوتە کـە ئەگەر مردم چم لێ بکەن. یانی من پێم وابوو لە کوردستانی عێراق دەمرم و تازە کوردستانی ئێران نابینمەوە.. یـانی ڕوخـانی ئـەو زۆردارەی بڕێك دوورتـر بـوو.. پێـم وابـوو دوورتـرە.. بـە ڕاسـتی ئینقلابی ئێرانی وەکو من دە خەیاڵی خۆمدا پێشبینیم کردبوو، پێم وا نەبوو وا هاسان و وا زوو ئیمپریالیزمی پاشەکشە دەکا.. ئەگەرچی ئێستاش نەیکردوە، بۆ خۆت دەزانـی.. ئـەوی زوڵـم و زۆرە هەر دەیکا، بەڵام نیوە بەزیوێکی، بەڵکە بەزیوە ئیدی..

—دیسان یەکێ لەو شتانەی کە زۆر باسی لێوە دەکرێ، شاعیرو سیاسەت، یا نوسەرو سیاسەت. تۆ پێوەندیی ئەو دووانە چۆن دەبینی؟! سیاسەت شیعر ناکوژێ؟ بە تایبەتی خۆ بەستنەوە بە سیاسەتی حیزبایەتی، شیعر ناکوژێ؟

—وەڵڵا، بە عـەقیدەی مـن، زۆر زەرەر دەدا لـە شـاعیر، زەرەری زۆر گەورەش دەدا، موقەییدی دەکا، بەڵام بۆ کوردێك چ بکا؟! پێی وایە ئەوەش ئەرکێکە لـە سەرشانی کە دەبـێ بـۆ ڕزگـاری خـۆی هەوڵ بدا.. ئەمن لە وڵاتێکیدا بام کە ژیانێکی نەتەوایەتی سەر بە خۆم هەبا، پێم وایە قەت نەدەچوومە ناو سیاسەتەوە. یانی من پێم وا نییە ئەدەب لە سیاسەت دووربێ.. ئەوە شتێکی سەیرە.. کە هەرکەس دەتوانێ نەوعێك لە ئەدەب بۆ خۆی هەڵبژێرێ.. وە ئەدەب، هـەموو ئـەدەبێك، کـەم و زۆر لـە خزمـەتی سیاسـەتدا هـەر هەیە، بەڵام خۆبەستنەوە بە حیزبێك زۆر زەرەر لە شیعر دەدا. تۆ ڕەنگ بێ هەموو ژمارەکانی ڕۆژنامەی کوردستانت، کە لە عێراق دەردەچوو، وە ئێمە دەرمان دەکرد، هەمووت..

بینیومە.. بەڵێ..

—بینیوتە، وە لەوێ کەم شیعری من دە ڕۆژنامەکەدا چاپکراوە. ئەو شیعرانەی بێ ئیمزان زۆریان هی منن ئیدی. ئەو دەمەی من حەقم نەبوو هێمنیان لە بن بنوسم. ئەگەر ڕۆژگارێکی "تـاریك و ڕوون" بڵاو نەبووباوە تۆ نەتدەزانی "گەرمەشێن" هی کام شاعیرە، یا "کاروانی خەبات" هی کام شاعیرە، جا وەرە بە دوایدا بگەڕێ. دەبێ کێ بێ "کاروانی خەبات"ی گوتبێ، دەبێ کێ بێ "ئارەق و تین"ی گوتبێ.. مەسـەلەن شـیعرێکی کـە مـن بـۆ تـەرمی حـاجی قادری کۆییم گوتبوو، ڕۆژنامەکەی خۆمان حازر نەبوو چاپی بکا ئیدی. دەیگوت تۆ تازە ئاشکرا بووی و شاعیری ئەو شیعرەی، ئێمە دەمانەوێ شاعیری ئەو شیعرە ئاشکرا نەبێ. تەنیا شیعرێ کە من بە تەواو، وەکو خاتیرەیەکی، لەزەتم لە شیعری خۆم بردوە، چونکو تەئسیری ئاینی کردۆتە سەر خەلك، ئەو شیعرە بوو کە من بۆ تەرمی حاجی قادری گوتومە، بۆ کۆتەلی حاجی قادر گوتم. لەو کۆبونـەوەی کۆیـەدا، کاکـە، تەئسـیری ئـاینی هــەبوو لەسـەر خەلکەکـەی کـە لـەوێ بـوو. زۆرم ئـەو دەمـی خۆخۆشویسـت کـە دەتوانم شیعریکی وا بلیم..

—بەڵام شاعیری کورد، وەك گۆران دەیگوت:

لە پیش هەموو شتیکا چونکی کوردم
چۆلەکەی ناو هەزاران داوی وردم

—هەرچۆنێ بێ، خۆ دەبێ کوردایەتی بکا..

—بەڵێ..

—کوردایەتی لە پارتایەتی جیادەکەیتەوە؟!

—نەخێر.. ئەوەیە عەرزت دەکەم..، بەڵام پارتیك کە لە خزمەتی کوردا بێ. وەختیکی من پارتیکم دیت کە لە خزمەتی کوردا نەبێ، ئیدی بۆ دەبێ جاش بم کە من دەخزمەتی ئەو پارتییەدا نەبم؟!



من دەتوانم لە ریگایەکی دیکەدا خزمەتی ئەو کوردە بکەم. بە داخەوە سەرکردەکانی مە زۆر بیئینسافن، پییان وایە هەرکەس دەگەڵ وان نەبێ دوژمنی وانە..

—بەلام ئەگەر مەسەلەکە لەو چوارچیوەیە ببەینە دەرەوە کە مەبەست هەر تۆ یا شاعیری کورد بێ، با هەر باسی شاعیر بە گشتی بکەین.. ئایا شاعیر پیویستی بەوە هەیە لە ژیانیدا فەلسەفەیەکی هەبێ؟ خۆی بە فەلسەفەیەکەوە ببەستیتەوە؟!

—نەوەللا.. من زۆرم فەلسەفە لە شیعردا.. خۆش ناوێ. من پیموایە شیعر هەر ئەوەیە کە ئیحساساتی ئەو ئینسانەی بێ کە خۆی پێ شاعیرە..، بەلام وا دەبێ هیندیك هەن شاعیری باش کە فەلسەفە بە ئەندازەیەکی جوان دیننە بەرهەم. عەرزت دەکەم، مولاحەزە بفەرموو، فەلسەفە ناسکی شیعر دەکوژێ. حاجی قادری کۆیی، ئەو شاعیرە مەزنەی ئیمە، ئیتر ویستویەتی فەلسەفەی کوردایەتی، رزگاری کورد، بخاتە چوارچیوەی، چونکو وەسیلەیەکی دیکەی نەبوە ئەو بیروای خۆی بە کورد بگەیەنێ، ئیللا شیعر نەبێ، یەعنی نەزم نەبێ.. لە بیرت نەچێ.. من شیعرو نەزمیش فەرق دەکەم.. حاجی قادر ئەگەر تەماشا دەکەی.. تەماشای شیعرە غەرامییەکانی دەکەی شاعیریکی تەواو بوە..، بەلام وەختیکی تەماشای شیعرە سیاسییەکانی دەکەی ئیدی گویی نەداوەتە جوانی شیعر، هەر ویستویەتی ئەو پەیخامەی پییەتی، ئەو ریسالەتەی پییەتی بە خەلکی رابگەیەنێ. تەنیا کەسیکی کە من پیموایە فەلسەفەشی هەبوەو شیعریش.. فەلسەفەکانی حافزی شیرازییە، بە عەقیدەی من. لە عەینی حالدا شیعرەکانی یەك جار زۆر جوان و پر مەعنان، شیعریشن، فەلسەفەیەکی زۆر گەورەش لە شیعرەکانیدا هەیە. نوێ خوازییەکی زۆر گەورە لە شیعرەکانیدا هەیە کە ئیستاش بۆ من نوین. مولاحەزە بفەرموو پاش نیزیك بە حەوتسەد سال شیعرەکانی نوین، ئەو رۆکانەش نوین.. کەچی (مەسنەوی) کە بە لای ئیمەوە زۆر کتیبیکی گەورەی فەلسەفی یا عیرفانییە، هەریەك شاعیر وتویەتی.. دیوانی شەمس و مەسنەویش هەر شاعیریك گوتویەتی. لە دیوانی شەمسدا لە باری قالب و کەلیمات و ئەوەدا مەولەی زۆر گەورەترە، بەلام لە مەسنەویدا فەلسەفەکەی گەورەترە.. نازانم.. لیرەش دەبیتە دوو ئینسان لە جیگەیەکی توانیویەتی قالبی جوان، کەلیماتی جوان، فکری جوان لە شیعری خۆیدا بگونجینێ. دە مەسنەویدا زۆری گوێ نەداوەتە قافیەو وەزن و کەلیماتی جوان، هەر ویستویەتی فەلسەفەکەی نیشانبدا، عیرفانەکەی نیشانبدا..

—باشە ئەم ئیمتیازە بۆ تەنها دەدەیت بە حافز خۆ شاعیرە سۆفییەکان، بە گشتی، یا بلیین ئەدەبی سۆفی، ئەگەر هەمووشی نەبێ، ئەوا بەشیکی زۆری، شتی زۆر جوانیان گوتوە، ئەوجا سۆفیگەری نەك هەر لای ئیسلام بەلکە ئەوەی بە زمانانی ئەورووپایی پیی دەلین Mysticism دەوریکی گەورەی لە ئەدەبدا بینیوە..

—جا ئەوە سەیرە کە منیش بە خیلافی، بە پیچەوانەی هەموو کەس حافزم پێ سۆفی نییە..

—من مەبەستم بەستنەوەی فەلسەفەیە بە شیعرەوە..

—بەلێ..

—خۆ سۆفیزمیش..

—بەلێ، بۆ خۆی فەلسەفەیەکە. جا ئەوجار بیینە سەر ئەوە. ئەگەر بیینە سەر سۆفیزمیش.. هەن، شاعیری وا کە بە راستی سۆفیزمیان لە شیعردا زۆر جوان گوتوە، وەکو مەحوی خۆمان.. یا مەولەوی خۆمان، سەید عەبدولرەحیمی مەولەوی، بە راستی توانیویەتی. سۆفیزمی بە شتیکی مومتاز دەزانم، دەنا دیوانی شاعیرەکانی دیکەی فارسیش هی وای زۆر تیدایە.. سەنایی باس دەکەی، عیراقی باس دەکەی، بە راستی ئەوانەش زۆریان هەن، شاعیری زۆر بەرز، سۆفیزمیان زۆر چاك هیناوەتە ناو چوارچیوەی شیعرەوە.. بەلام حافیز من پیم وایە زۆر بەرزترە لە سۆفیزمیش، پیموایە عارفیکی زۆر گەورەیە، کە دەلێ:

بیا تا گل برافشانیم و می در ساغر اندازیم
فلك را سقف بشكافیم و طرح نو در اندازیم
اگرغم لشكر انگیزد كه خون عاشقان ریزد
من و ساقی بهم سازیم و بنیادش براندازیم

کوا ئەوە لەگەڵ شیعری سۆفییەکیوەك یەك دەچێ، ئەوە شیعریکە نازانم لە کوییە. هەتا مەسەلەن خەلك پیی وایە.. خەییام زۆر مەشهورە، کەچی، سەیرە، کە.. پیم وایە خەییام نە فەلسەفەی هەبوەو نە هیچ.. شك و دوودلی و تەردیدیك لە شیعرەکانیدا گونجاوە، کە بۆ خۆشی ئینسانیکی شەککاکە، کە نازانێ.. من فەلسەفەی خەییامم هیچ بەلاوە فەلسەفەیەکی عەجایب و غەرایب نییە. ئیدی ئەوە عەقیدەی شەخسی خۆمە. خەلکی دیکە نازانم تۆ چ بەراوردیکی لەوەی دەکەی کە من فەلسەفەی خەیامم زۆر پێ فەلسەفەییکی سەیر نییە..

—ئەی جەلالەددینی روومی؟! تۆ لە باشترین شیعرتا کە نالەی جوداییە، لە دوو شوینا پەنات بردۆتە بەر جەلالەددینی روومی.. بۆچی؟

—بەلێ.. من پیم وایە عارفیکی یەکجار زۆر گەورەیە..

—لەبەر عارفییەکەی یا لەبەر شیعرەکانی؟!

—عەرزت دەکەم.. عەرزم کردی لە شەمسدا.. لە دیوانی شەمسدا شاعیریکی زۆر گەورەیە.. لە مەسنەویدا ئەو شاعیرە نییە، یان ساحیبی ئەو قالبە کە لەویدا ئیستیفادەی لیکردوە، ساحیبی ئەو کەلیماتە جوانانە نییە کە لە شەمسدا، لە دیوانی



شەمسدا باسی کردوە. مەسەلەن ((خود)) و ((بەد- بد)) کە ئەلعان ئیمە تەلەفوزی دەکەین، زۆر جاری کردۆتە قافیە، کە ئەودەمی زۆر عەیب بوە، بەڵام گویی نەداوەتە قافیە.. ئەگەر تەنیا موقەدیمەکەی کە من.. مینش هەر زۆر لە موقەدیمەکەی موتەئەسیرم: بشنو از نی چون حکایت میکند.

کاکە، ئیدی ئەوە.. ئەلعانیش ئەمن هەر تییدا حەپسم.. لە موقەدیمەکەی بەولاوەتر ناچم.. پیم وایە موعجیزەیە، شیعر نییە.. لە موعجیزەش گەورەترە..، بەڵام لە دیوانی شەمسدا کە دەڵێ.. تەماشای ئەو شتە جوان و تازەی، کە ئەلعانیش هەر تازەیە.

دی شیخ با چراغ همی گشت گر شهر

کز دیو و دد ملولم و انسانم آرزوست

لەو دەمیوە لە ئینسان دەگەرێ، ئیمە ئەلعانیش لە قەرنی بیستەمدا.. ئاخرو ئۆخری قەرنی بیستەمدا هەر لە ئینسان دەگەرێین..

-بەڵام دیوجین، ئەوەی یۆنانی، پیش ئەو، دەلین بە چراوە دەگەرا، دەیگوت لە ئینسان دەگەریم..

-بەلێ.. ئیدی ئەو.. بەڵام ئەو خستویەتیە ئەو زوبانە جوانەوە.. لە ئینسان دەگەرێ.. بە راستی لە ئینسان دەگەرێ..

-باشە پیت ئەم ئیعجابەی تۆ، ئەم خۆشەویستنەی تۆ، بۆ جەلالەددین مەسەلە ئەوەیە تۆ زیاتر فارسی دەخوینیتەوە..

-بەلێ.. جا من چ بکەم.. غەیری فارسی و کوردی چی دیکە نازانم.. زبانی دیکە نازانم غەیری فارسیو کوردی.. وە کوردیەکانیشمان.. بە خوای.. کاکە.. مامۆستای وا هەیە دەلی.. میژووی ئەدەبی شەش هەزار شاعیرم کۆکردۆتەوە، بەڵام ئەمن هەرچەند دەیانبیژم هەر قامکەکانم بەسن بۆ شاعیرە گەورەکانمان.. بۆ شاعیرە گەورەکانی پیشومان. وە لەنیو لاوەکاندا دەبینم شاعیر هەن و ئەمما ئیدی ویستاکاڵ و ویستا مەجالیان نییە شیعر بلین و.. چوزانم، هەزار دەردو گرفتاری کە بۆ خۆت دەزانی بۆ شاعیری کورد هەیە، بەڵام شاعیرە گەورەکانی مە.. مامۆستا عەلائەددین سەجادی، هیندەی گل لە سەر وییە، هیندە عومری لاوەکانمان بن کە دەیانەوێ میژووی ئەدەبی کوردی ئینشائەللا بنوسن.. ئەو کتیبە زەلامە، پیموایە دوازدە شاعیرە باسیان دەکا، کە هیچیشیانی نەتوانیوە بە خەلك بناسینێ ئەوەیە کە.. کاکە.. چ بکەین.. لەبەر وەی روو دەکەمە ئەدەبی فارسی، بلیم چی، ئەدەبی فارسی ئەدەبیکی دەولەمەندە.

-تۆ باسی حافزو مەولانات زیاتر کرد، ئەدەبی فارسی هیچی تری تیا نییە؟!

-هاه.. شاعیری زۆر گەورەی تریش هەیە.. مەسەلەن گەنجەوی، کە کەسیش نازانێ میللیەتی چییە.

-دەلین کوردە..

-کورد دەلی کوردە، چونکو دایکی:

گر مادر من رئیسەء کرد

مادر صفتانه پیش من مرد

ئەوە گومان لەوەیدا نییە دایکی کوردە. تورکیش دەلین تورکە، چونکو قەبری لە گەنجەیەو ژنیکیشی هەبوە بە نیوی "ئافاق" تورك بوە. بەڵام من عەقیدەم وایە نە لاوانەوەی رەئیسە خانمی دایکی کردوویەتیە کاژیك (پیدەکەنێ)، نە ئافاق خانم کردوویەتیە پانتورکیست، نە.. پیاو نازانێ بابیشی کییە بە راستی.. بۆ خۆی.. ناوی دەبا، بەڵام میللەتەکەی نالێ، بۆ خۆشی بە میللەتی نەنازیوە، وەك فیردەوسی دەلێ:

بسی رنج بردم در این سال سی

عجم زنده کردم بدین فارسی

بە عەقیدەی من ئەو عەجەمی زیندوو کردۆتەوە بە پینج گەنجەکەی، بەڵام نەیگوتوە زیدووشم کردۆتەوە.. بە زمانی فارسی چاك دەردەبرێ. رەنگبێ تورکیشی زانیبێ، تۆ پیت وایە پیاو دایکی کوردبێو کوردی نەزانێ، بە عەقیدەی من زانیویەتی..

-دەبێ زمانی دایکیشی زانیبێ..

-ژنیشی کورد (بیگومان مەبەستی مامۆستا هیمن تورکە، نەك کورد. ف) بێ، ئیدی چۆن، چۆن نازو.. ئەو خانمەی هیندەی خۆشویستوە.. پیم وا نییە بە لالی ئەویش رازی بکات.. بە زبانی بەینەلمیلەلی (بین المللی) ئەوە کوا جیبەجێ دەبێ (پیدەکەنێ).. بەڵام فارسی پیی وا بوە موناسیبترە بۆ شیعرەکەی، بۆ ئیحساساتەکەی. وە لە هیچ کوێ نالێ من بۆیەم ئەو شیعرە بە فارسی گوت پیموایە فارسی چاترە لە تورکی یا لە کوردی، بەڵام تەواوی ئاسارەکەی، حەتتا بۆ نمونەش ئیمە نابینین ئەم کابرایە میسرەعیکی کوردی گوتبی، وەکو هیندیك بۆ خۆت دەزانی، شاعیرەکانی مە، هی قەرنی نۆزدەمان، بۆوەی کە بلێ فارسی دەزانین، ئەقەلەن.. باوەر بفەرموو وەختیکی دیوانی مەحوی بلاوبۆوە من زانیم مامۆستا گۆران فارسی باش نەزانیوە، چونکو کاکەی فەللاح بۆی گیرامەوە گوتی مامۆستا گۆران دەلی ئیوە شیعرەکانی مەحوی مەعنا نازانن، هونەری مەحوی لە فارسی گوتنەکەیدایە، وە حالیکی من دەزانم، فارسییەکانی، بە داخەوە، هەر کاویژی کوردییەکانیتی (پیدەکەنێ).. وە بە کوردییەکەیدا زۆر چاکی پتر دەربریوە، کەوابوو..

-ئەی مەولانا فارس بوو، تورك بوو، چ بوو، بەلای تۆوە؟!

-وەللاهی، کاکە، ئەویش. بروا.. نازانم.. لە بەلخەوە هاتوە، بەلخیش ئەودەمی.. فارسی زوبانیکی.. رەواجی هەبوە، نوسین بە فارسی بوە، تۆ بۆ خۆت، کاکە فەرهاد، پیت وایە تاران بە قەد سولیمانی تۆ فەرەیدون و ئیرەج و نازانم گەر شاسب و.. ئەوەی تیدان.. ئەسفەندیارو.. وەللاهی رەنگبێ تاران بە قەد سولیمانی سی سال لەوەی پیش ئەسفەندیاری تیدا نییە.. ئەدەبی فارسی رۆیوە کاکە.. ئەدەبی فارسی رۆیوە، وایلیکردون کە پادشایەکی

عوسمانی، کە بۆ خۆت دەزانی، خەلیفەکانی عوسمانی ویستویانە، هەمیشە شەریان بوە لەگەڵ فارس، کەچی بە فارسییان شیعر گوتوە بۆ خۆیان. من زۆر بە زەحمەت، لە بولغاریا بووم، فیری ئەو خەتە عەجایب و غەرایبەی بووم کە ئەوان پییان دەنوسی، بۆ ئەوەی تابلۆیەکی بخوینمەوە. رۆژیکی بەبەر دەرکیکدا رۆیشتم، تەماشام کرد لیی نوسراوە "مەیخانە" ئەوپەری تەعەجوبم کرد، گوتم کاکە مەیخانە چ دەکا لە بولغارستانی؟! تەماشا دەکەم لیرەرا رۆیوە، چۆتە تورکیەو لە تورکیەیرا، لەگەڵ تورکان چۆتە بولغارستان و لەویٚ بە "بار"یٚ کە لە تەواوی ئەورووپایێ دەڵین بار..

—لەویٚ بۆتە مەیخانە..

—لەویٚ بۆتە مەیخانە.. کەوابوو ئەدەبی فارسی رۆیوە ئیدی.. ئیمەی کورد، سەیرە، دیوانی خانای قوبادیت نازانم بە نەزەر گەیوە یا نە؟ ئیستاش، وە ئەمن مەم و زینیکی کۆنم، ئەلعان، لیرە، لە کن رەفیقیك هەیە، کە ئەودەمی هەمزە بلاوی کردۆتەوە، سەر بەحسەکانی هەموو بە فارسی نوسیوە..

—راستە..

—کەوابوو ئیمە پیمان وا نەبوە کوردی.. بابی مە پیی وا نەبوە کوردی نەسری پێ دەنوسرێ. هەر پیی وابوە شیعری مومکینە بێ بکوترێ، ئەمما نەسری نابێ پێ بنوسری، حالیکی ئەمە دەزانین، کە بە راستی دەتوانین پەخشانی زۆر بەرز بە زمانی کوردی بنوسین. من "شازادەو گەدا"م لە فارسیرا، دیارە، تەرجەمە کردوە، هی مارك تۆینی. لە بیرمە بە موتەرجیمە فارسییەکەی، کە بە راستی جیی فەخری ئیرانە، وە ناتوانم بلیم. جیی فەخری کوردە، با وجودی کە کوردە، چونکو خزمەتی بە زمانی فارسی پتر کردوە بە داخەوە، کوردی وا باش نازانێ ئەگەرچی کوردیش دەزانێ، ئاغای محەمەدی قازی، کە ئەگەر ئینشائەللا ریت لە تارانێ کەوتەوە بە خزمەتی بگە، بە راستی پیاویکی زۆر گەورەی کوردە.. ئەو.. نازانم لە چ زمانیکیرا وەریگیراوەتە سەر فارسی، منیش لەسەر فارسییەکەی ویرا کردوومەتە کوردی. بە داخەوە ئیستاش چاپ نەکراوە. هەر لە عیراقیشم کردبوە کوردی. وە لیرەدا بەحسیکی دیکە دیتە گۆرێ. من دە عەینی حالدا کە نالەی جودایيم دەگوت، بۆ ئەوەی کە بریکیش دلی خۆم خۆش بێو پیکەنینیك بیتە دلم، شازادەو گەداشم تەرجەمە دەکرد کە کتیبیکی تەنزو.. رۆژیکی عەرزم کرد، گوتم مامۆستا من شازادەو گەدام لەسەر فارسیەکەی تۆ تەرجەمە کردوە، دە زۆر جیگایان پیم وایە رەتم کردوە لەتۆ، بەلام لە جیگای واشە زۆر دەست کورتم.. کوتی، تەوازوعی فەرموو، فەرمووی، تۆ نەخیر هەر چاترت کردوە، بەلام واقعییەت ئەوەیە، لە جییەکی من گەیشتومە باسی هەژاری، فەقیری، نەداری، باسی هەژاریو فەقیریو نەداری چارەرەشیو بەدبەختی دەکەم، بەبێ شك (چاکم) کردوە، چونکو ئەوەندەم لە ئیختیاردایە، فرمیسك و رۆندك و نازانم هەزاران چم لە ئیختیاردایە.

—لای فارس نەبوە..

—لای فارس نییە. بەلام وەختیکی دەگەمە تەخت و تاج و پادشاو تالاری پادشاییو پەردەی پادشایی و سفرەی پادشایی، تەماشا دەکەم منیکی کە لەسەر کەولی رەق نانم خواردوە، چۆن دەتوانم، ئەو کەلیماتانەی لە کویٚ بینم کاکە.. منیکی کە بە نان و ماست و لۆرك و شیریژ پەیدا بووم، کوا دەزانم باسی خۆراکی پادشایانە بکەم، وە لەویدا زەعیفم. من خۆم ئیعتیراف دەکەم زەعیفم.. لە باتی ئەعلا حەزرەتی، قەبەر قودرەتی، نازانم هومایونفەری، نازانم چی، ئیمە هەمانەو نیمانە خاوەن شکۆیە (پیدەکەنێ)، ئەویش دروست کراوە بۆ خۆت دەزانی.

—باسی نەسرو شیعرو ئەوەت هینایە پیشەوە، باسیکی چاکە! زۆر کەس پیی وایە تۆ نەسرت لە شیعرت جوانترە!

—وەللاهی منیش.. هەر لە ئەوەلی موساحەبەکەمدا گوتم، ئەگەر کورد نەبام، مەجبور نەبام ئیحساساتی خۆم بە شیعرەوە بە خەلك رابگەیەنم، منیش پیم وایە نەسر نوسینم خۆشترە. وە نەبێ بۆ خۆم موخالیفی ئەو کەسانە بم کەوا دەلین.

—بیجگە لە ئەدەبی فارسی، ئەدەبی میللەتانی تر چیو چەندت خویندۆتەوە، مەبەستم لە ریگەی فارسییەوە..؟!

—بەلێ.. هەر لە ریگەی فارسییەوە.. وەللاهی، کاکە، من تەقریبەن رەنگبێ دوو سال بێ، موتالەعەم لە کەمی داوە، چونکو کاری دیکەم هەیە، بە داخەوە موتالەعەم کەمە، دەنا پیموایە تەواوی شاکارەکانی ئەدەبی غەربی کە بە فارسی تەرجەمە کرابن خویندومەتەوە. مەسەلەن پیموایە هیچی چیخۆف و تۆلستۆی و شۆلۆخۆف و ئەوە نەمابێ نەمخویندبیتەوە.

—ئی دیستۆفسکیو شەکسپیر؟!

—شەکسپیر، کاکە، من بە راستی لە شیعری تەرجەمە.. شیعری شەکسپیرم خویندونەوە، بەلام من لە شیعری تەرجەمەکراو ئەو لەزەتە نابەم کە.. وەختیکی هاملیت دەخوینمەوە نازانم، بە راستی ناتوانم گەورەی شەکسپیریك کە بۆ منی تەشریح دەکەن، بەو هاملیتەی، دۆنی ئارام دەخوینمەوە شۆلۆخۆفی وا دەناسم. وەختیکی جەنگ و سولحی تۆلستۆی دەخوینمەوە، وەختیك ئاناکارنینای دەخوینمەوە، وەختیکی چیرۆکەکانی جاك لەندەن و ئەوی دیکە، نیوی چییە پیاو!!، (خۆشەهای خشم) هی کییە، نازانم، دەخوینمەوە، بە راستی ئەو نیوە ئەورووپاییانەش هیندە ناخۆش دینە بەرگویی پیاوی نازانم بیانلیم. ئەمما، بەلی شاکارەکانی ئەدەبیاتی غەربم هەموو..

—جۆن شتاینبیکی ناوە..

—بەلێ.. بەلێ.. وەختیکی (خوشەهای خشم) دەخوینمەوە دەزانم چی گوتوە.. بەلێ.. بە راستی.. باسی دۆمای کرد..

ئەلیکساندەر دۆما منی زۆر کیشا بۆ لای.. دیارە بۆ خۆت دەزانی زۆر رۆمانتیکن نوسینەکانی، بەلاّم بە راستی پیاوی بە زەوق دەکەن، یانی پیاو ناتوانیّ.. فیری خویندنەوەی دەبیّ. وەختیکی سیّ چەوەندەری دۆمای دەخوینییەوە ئیدی ناتوانی دەست لە خویندنەوەی هەلگری. پیموایە حەتا من لە بیرمە بە جەوانی چیرۆکەکانی پۆلیسیشم دەخویندەوەو زۆریشم بەلاوە خۆش بوو.

—شەرلۆك هۆلمزو شتی وا..؟!

—بەلیّ.. ئەوانەشم دەخویندەوەو زۆریشم بەلاوە خۆش بوو. ئەم رۆژانە باسی ئەوانەم بەوانە کرد، دوایە دەستم بە خویندنەوەکانی دۆماو نوسەرانی رۆمانتیکی فەرانسەی.. زیاتر ئەودەمی لە فەرانسەوە شت دەکرا بە فارسی.. باوەر دەکەی تۆ، من (بینوایان)ی فیکتۆر هۆگۆم لە سیّ رۆژندا خویندبیتەوە چونکو رەفیقەکەم بە ئەمانەتی دامیّ، گوتی لە سیّ رۆژان زیاتر نابیّ، وە هەمووشم خویندۆتەوەو ئەلعانیش کە دەیکەمەوە، رەنگبیّ چل سالّ رابردبیّ بەسەر ئەو خویندنەوەی مندا، ئەگەر دەیکەمەوە، تەماشا دەکەم دیتەوە بیرم، ئەو دەمی هیندە بە دیقەتم خویندۆتەوە. ئەلعان وا نیم، بە داخەوە، کتیبیکی دەخوینمەوە لە بیرم دەچیتەوە. ئەمما بە مندالی خویندومەتەوە، بە جەوانی خویندومەتەوە، تازە ئیدی تازەگی بۆ من نەماوە.

—باش بوو هیناتە سەر باسی خویندنەوە، تۆ چیت خویندۆتەوە، چ دەخوینیتەوە؟! یانی خویندەوەکانت زیاتر لە چ مەجالیکدان؟!

—وەللاّهی کاکە، من بە راستی عەلاقەیەکی زۆرم بە داستان هەیە، رۆمان هەیە..

—تۆ خۆت شاعیریو داستان زۆرتر دەخوینیتەوە..

—زۆرتر دەخوینمەوە.. زۆر سەیرە، باوەر بفەرموو وەختیّ دیوانی شاعیریکم وەدەست دەکەویّ، لە پیشدا موقەدیمەکەی دەخوینمەوە. پیم خۆش لە پیشدا موقەدیمەکەی بخوینمەوە تا بچمە سەر شیعرەکانی. پیم خۆشە بزانم نەسرەکە چۆن نوسراوە لە بارەیدا، ئەو شاعیرە چۆن بە من ناسینراوە بەلیّ، رۆمان و داستان دەخوینمەوە، بەلاّم تۆ نازانی بە راستی لە فارسیشدا، بیجگە لەوەی تەرجەمە کراوە، پیموایە شاکارەکانی ئەدەبیاتی غەرب هەموو تەرجومە کراون، ئەمجار خۆشیان، فارسی بە راستی بە راستی نوسەرو شاعیری گەورەیان هەیە نوسەری گەورەیان هەیە. باوەر بکە ئەو بەینانە کتیبیکم خویندەوە، (از صبا تا نیما)، ئەدەبی کوردی لە بەینی دوو شاعیردا شاعیریك کە..

—ئەدەبی فارسی..

—بەلیّ. ئی فارسی، بەلیّ.. باوەر بفەرموو پیاو تەعەجوب دەکا، ئەو ئینسانە چەندی موتالەعە کردوە بۆ نوسینی ئەم کتیبە، وە چۆنی توانیوە نەسر نوسەکان و شاعیرەکانی (صبا) وە تا (نیما) —پیموایە قەرنیك یا قەرن و نیویکی بەینە— هەمووی بە خەلك ناساندوە. نە ئەوەی کە مەسەلا عیشقی هەمەدانی بابی نیوی سەید ئەبولقاسمی کوردستانی بوە. ئەوە موهیم نەبوە لە نەزەر ویدا، چی کوتوە ئەو کابرایە، ئەوە بۆ وی موهیم بوە، وە تەحلیلی کە ئەو کردویەتی لەسەر ئەوە، کە بە داخەوە ئیمە ویستاش شتیکی وامان لە ئەدەبی کوردیدا نییە. ئەوەش هی چییە.. من خودای نەخواستە، پیم وابیّ کورد بیّ ئیستیعدادە؟! نا.. خودای نەخواستەش نییە، چونکو بروام بەوەی هەیە کە کورد بە ئیستیعدادە، بەلاّم مەجالی نییە کاکە. ئەلعان ئایە ئەگەر محەمەدی قازی مەجالی با، ئەو هەموو کتیبەی کە بە فارسی تەرجەمە کردوە -رەنگبیّ بۆ خۆشی حیسابیان نەزانیّ چەندی کتیب تەرجەمە کردوە— بە فارسی تەرجەمە دەکرد؟! نا.. پیموایە ئەگەر لە کوردستانیکدا با بۆ کوردی تەرجەمە دەکرد. وە ئەلعان تەسمیمی گرتوە کە ئەوی تەرجەمەی دەکا، حەدی ئەقەل حەولدا شتیّ تەرجەمە بکا کە لەسەر کوردی شت تیدابیّ، کە ئەلعان کوردو کوردستانەکەی نیکیتینی لەبەر تەرجەمەدایە، و ئەو رۆژانە پیموایە، ئینشائەللاّ دەگاتە دەستمان و ئەگەر منیش بمینم یا بۆ خۆم تەرجەمەی دەکەمە سەر کوردی یا یەکی دیکە وادار دەکەم کە تەرجەمەی بکاتە سەر کوردی. یەکیك لە مامۆستاکان کتیبیکی بە عەرەبی.. من نەمدی، ئەودەمی چاپ نەکرابوو، گوایە، دەبیّ پاش من چاپ کرابیّ.. قەتم لەبیر ناچیّ، وە ئەوە داخیکە لە دلما. گوتم تۆ بۆ لەسەر ئەحمەدی خانی بە عەرەبی دەنوسی، خۆ ویستا کورد ئەحمەدی خانی نەناسیوە، بۆ بە عەرەبی دەناسینی؟!.. گوتی وەللاّهی کاکە ئەوە پولی پتر تیدایە.. باوەرم پیدەکەی، بۆ خۆم لیمبیستوە. ئایا من دەبیّ چ بکەم ئەحمەدی خانی نەناسم وەکو.. وەك ئەو دەیناسی، یا وەك هەژار دەیناسیّ، من نایناسم. وە لەبەری پارامەوە، کوتم بریا تەرجەمەت نەکردبا شیعر بە شیعر، پیت ناساندباین.. پیت ناساندباین خانی چییە، بە راستی خانی ناناسین، بە راستی نازانین چ بلیمەتیك بوە. بە خۆرایی نییە کاکە، رەنگبیّ لە جیگایەکی دیکەشدا نوسیومە کە کاکە ئیوە چ هەراوهوریایەکتانە. شیعر هەر بە کوردی بلین و کەلیمەی عەرەبی تیدا نەبیّو.. خۆ بۆ مەم و زین دەبیّ تەماشای قاموسی فیروزئابادی بکەی تا لە کەلیمەکانی بگەی، بەلاّم تا ویستا، بۆ خۆت دەزانی، بە چەند زمانی دنیایە تەرجەمە کراوە مەم و زین..

—بە زۆر زمان..

—بەلیّ.. کەوابوو بەوەی کە: (سەرنامە بە نامی تۆیە ئەللاّ) بەوەی پیم وانییە خانی لەبەرچاوی دنیایە کەوتبیّ، شاعیریکی گەورەیە.

—راستە.. خانی.. ئەلبەتە دوایی دیینەوە سەر خانی.. خانی تەنیا شاعیر نییە، موفەکیرە، خاوەن بیرە، بیریارە، دەردی کاك مەسعود دەلیّ.. وە باوکی کوردایەتیشە..

—بەلیّ..

—یەکەم کەسە کوردایەتی کردوەو بە پرۆگرامیش کردویەتی..

—بەلی بە پرۆگرامیش.. وە من.. با ئەوەشت عەرزکەم، کە کوردایەتی، یا ناسیۆنالیزم لە شیعری خانیدا، دیفاع لە هەژارترین، چارەرەشترین قەومی دنیایە بوە، وە حەتتا ئەو کەسانەی کە موعتەقید بە ناسیۆنالیزمیش نین، ئەگەر لە موقابیلی ئەوەیدا، ئەگەر بلیم ئەوە ناسیۆنالیستە زولمە.. ئەوە ناسیۆنالیستی نییە.. دیفاع لە..



—بۆ خۆت دەزانی.. ئەو باسەی کە زۆر جار خەلك وای باس دەکەن.. شەری نیوان، یا بلیین پیوەندی نیوان نوسەرو رەخنەگر.. تۆ چۆنی دەبینی؟! بۆ خۆت تەجروبەی خۆت لەو بارەیەوە چۆن بوە؟

—وەللاهی، کاکە، من، بە داخەوە، کەم رەخنەگری وام دیوە، کە لە کوردستاندا، لە خۆم رەخنەی باش بگرێ.. بەلام زۆر بروام بە رەخنەگر هەیە. من پیموایە رەخنەیە نوسەرو شاعیر دەکاتە نوسەرو شاعیر. وە هەر شاعیریکی یا نوسەریکی، لە ترسی رەخنەگر، دەستی بە قەلەمەوە نەلەرزیبێ وەختی نوسینێ، پیموایە قەت ناگاتە.. نازانم لە کویدا خویندومەتەوە دەلی شاعیریك بە رەخنەگریکی گوت، گوتی ئەمن دەچمە هەر جیگایەکی پەیکەری شاعیریکی لییە، بەلام تا ئیستا پەیکەری رەخنەگریکم نەدیوە لە هیچ کوێ. کوتی ئاخر لە سایەی ئیمەیە کە ئیوە..

—پەیکەرتان بۆ دەکرێ..

—پەیکەرتان بۆ دەکرێ.. بەلێ.. من پیموایە رەخنەگر زۆرباشە وە بە داخەوە کورد.. من.. لە کوردستانی عیراق دەگەل مەتبوعات سەروکارم بوە، خەلك زۆر دوژمنایەتی لەگەل پیاوی پەیدا دەکرد ئەگەر رەخنەی لیدەگرت. تەنیا کەسیکی کە رەخنەیان لیگرت و رەخنەیەکی بە عەقیدەی من بەجیش نەبوو، هی دلشاد محەمەد ئەمینە لەسەر من. خۆی لیدەشاردمەوە، رۆژیکی لیی گەرام، ماچم کرد، گوتم کاکە گیان تۆ بویە باعیسی ئەو هەموو هەرایەی..

—لەسەر تاریك و روون کرا..

—لەسەر تاریك و روون.. نەخیر، وەللاهی بە کەیفی خۆتم لەسەر بنوسە.. زۆریشم پیخۆش بوو.. ئەلعانیش هەر پیموایە کە رەخنەگر زۆر زۆر دەوریکی گەورەی لە بوژاندنەوەی ئەدەب و فەرهەنگی میللەتیکدا هەیە.

—ئەی بلاوکردنەوە چۆنە بەلاتەوە؟! زۆر کەس پیی وایە کە پیاو مەجالی هەبوو بلاوبکاتەوە، شتی خراپیش دەلێ.. وای لیدەکا، حەز لە بلاوکردنەوە کردن وای لیدەکا کە شتی کال و کرچیش بخاتە سەر لاپەران..

—وەللاهی، کاکە، ئیدی،.. من هەر ئەو رۆژانەش دەگەل مامۆستا هەژار لە باری وەیدا موناقەشەیەکمان بوو. من پیموایە هەموو نوسینەکانی ئەو کەسانەی دە - پازدە کتیبیان نوسیوە، بە ئەندازەی شیعری شوکری فەزلم بەلاوە موهیم نییە.. هەر ئەو غەزەلەیشم لیدیوە، ئەو پینج- شەش شیعرەی بۆ کوردی گوتوە: کار کە رووی ئیستە لە هەورازە سەرەولیژی نەکەی.. (راستییەکەی: ئیش کە روی ئەمرۆ.. ف) من پیموایە کەم و پوخت زۆر چاکترە، وەك زۆرو.. لەگەل زۆرو بۆری یەکجار موخالیفم. پیموایە کەمی بنوسی‌و چاکی بنوسی باشە.

—سانسۆرت پیچۆنە؟!

—وەللاهی لیی بیزارم..

—سانسۆری سیاسی ئەلبەتە..

—بەلێ.. بەلێ.. ئیدی.. وەللاهی لە هەموو نەوعە سانسۆریکی بیزارم..

—ئەی هەندێ جار پیاو خۆیشی دەبێ بە سانسۆری خۆی..

—بەلێ، لیی گەرێ شاعیر بۆ خۆی، یا نوسەر بۆ خۆی سانسۆری خۆی بکا..

—باشترە..؟!

—باشترە.. دەزانی، سانسۆر زۆر لە زەوق دەدا! حەتتا سانسۆری ئەخلاقی، حەتتا سانسۆری نازانم عەقیدەتی. بە عەقیدەی من لیی گەرێ، پیی بلێ خۆت خۆت سانسۆر بکە نوسەر! نوسەریکی عەقلی وەی نەبێ خۆی خۆی سانسۆر بکا حەیفە هەر قەلەم بە دەسەوە بگرێ.

—یانی لەو کوردستانیکدا ئەگەر تۆ وەزیری راگەیاندن بی، چ دەکەی..

—وەللاهی ئەگەر (پیدەکەنێ)..

—کە ناشبی..

—بەلێ.. دیارە.. (آرزو بر جوانان عیب نیست)، لە فارسیدا شتی وا هەیە.. بەلام قەتی ئەوەی نابینم ئەمما ئەگەر ببیەم.. ئیللا شتی خراپ نەبێ.. ها.. (پیدەکەنێ).

—شتی خراپ چییە؟!

—شتی خراپ، لە باری ئەدەبییەوە ئەرزشی نەبێ، دەنا لە باری دیکەوە هەرچی دەیلێ من سانسۆری ناکەم، بەلام کەسیکی بە راستی ئەرزشی نەبێ‌و بیەوێ خۆ بەسەر خەلکیدا بسەپینێ رەنگبێ (پیدەکەنێ) نەیەلم شتی‌وی چاپ بکرێ..

—ئەی باشە، باشتر نییە ئەوەش بکەویتە بەرچاوی خەلك و خەلك بۆ خۆی بلێ تۆ خراپی..؟!

—کاکە، هیند دواکەوتوین، بە داخەوە. مامۆستا زەبیحی دەیگوت، بۆ خۆی هەزار جاری گوتوە، لە کتیبەکەشیدا نوسیویەتی. نوسیویەتی، من نامەیەکم لە بەروارەوە بۆ هاتوە، وەختێ کۆمەلەی ژیکاف بووم، نوسیویەتی بەرواری..

—ئەوەندەی ئەوەندە..

—ئەوەندی ئەوەندە.. دەلێ پەنجا سالە.. من بۆ خۆم ئەودەمی بە تەئریخم زانیوە، پەنجا سالە خەریکم لە بیر خەلکی بەرمەوە لە بیری ناچیتەوە. وە باوەرم پیبکە لەو نامانەی کە ئیستا بۆمان دێ، بۆ سروە دێ، ئەغلەبی بەرواری نوسیوە.. بلین چی.. وەختیکی غەلەت هاتە گۆرێ.. نازانم بۆ ئەو کوردە ئەو نەخۆشییەی هەیە، شتی غەلەتی چاتر دیتەبیر..

—تۆ، ئەلبەتە، سانسۆرت تووش بوە، سانسۆری داگیرکەرانی کوردستان..

—تەواوی ژیانی خۆم ئەمن لەژیر سانسۆردا بووم..

—ئەی سانسۆری کورد..؟

—لەژیر سانسۆری کوردیشدا بووم.

—ئەوەیان چۆن..؟

—وەلـلا، کاکە، ئەوەم دەتوانی رەفع بکەم. سانسۆری کوردم دەتوانی رەفع بکەم، بەوی دەویرام. لەو لایە، وەکو عەرزم کردی، وەختیکی ئەندامی حیزب بووم، سانسۆریان دەکردم، دەچووم لە جیگەیەکی دیکە بلاوم دەکردەوە، یا ئەقەللەن دەمدایە دەسی خەلکی..



—ئەی ئەو شیعرانەت کە بە بێ ناو لە کوردستاندا بڵاوت دەکردنەوە، مەبەستم لە ڕۆژنامەی کوردستاندا..

—بەڵێ، ئیدی ئەوە سانۆڕەکە بوو، بەڵام لە تاریك و ڕووندا بەنیوی خۆم بڵاوم کردنەوە.. بڕوا بکە لە تاریك و ڕووندا شیعریکم هەیە، کە دیارە دەبێ ئەوەش لەبیر نەچێ کە مەحەللییە. لە مەهاباددا وەختیك کە من ئەو شیعرەم بڵاوکردەوە بەنیوی (ڕاوە بەران)، ئەوەڵا شوجاعەتیکی سەیرم کرد، کە چەکی ڕاویان، تفەنگی ڕاویان لە هەموو کەس ستاندبۆوەو کە لە عیرقا تەقە هەیە، نابێ لیرە تۆ تفەنگی ڕاوت بە دەستەوە بێ، من ویرام، بۆ خۆشم ڕاوکەر بووم ئەودەمی، ئەو ئیحساساتەی خۆم بڵاوبکەمەوە. لەویدا بریکیشم گاڵتە کردوە. لە کوردستانی عیراق ئەو شیعرەی من زۆری دەنگ نەداوە، بەڵام لە کوردستانی ئیران ئەو وەختی دەنگیکی عەجایبی داوە، چونکو ئەوەڵا کەس نەیدەویرا بلی بۆ شا چەکی لە خەلکی ئەستاندەوە. من ئەوەم بڵاوکردەوە، بەڵام دە لیباسی جەفەنگ و شتی وادا ونم کرد. حەتتا وایان لیهاتبوو زابتەکان، ئەفسەرەکان، ئەفسەرەکانی ڕاوکەر بۆ خۆیان هەموو لە بەریان بوو، ئەوانی کورد. مەسەلا دەویدا دەلیم:

ئیتر مەحموود بانادا سمیلی

سمیلٚ بادانی پێ عەیبە بە دیلی

کە ڕاوکەر بێ تفەنگ ئەلبەتە دییلە

لە هەموان دیلتریش مەحموود سمیلە

لەوانەدا دوو سێ شیعری وای تیدا بوو کە پساوە، ئەلعان دیمەوە، پاش ئەوەی هاتوم مەهابادێ، پیم دەلین بۆ ئەو شیعرەی تیدا نییە. خەلکی مەهاباد لەبەریان ماوە، بەڵام سانسۆری حیزب ئەو شیعرانەی لیپەراندن. هەرچی حەولم دا کە باوکم ئەقەللەن نوختەیان لە جیگا دانین.. گوتیان نا. کەچی شیعرەکە لەبیر خەلکی ماوە. ئەوە سانسۆری حیزب بوو کە ئەمە کەلیمەی سوکی تیدایە. بریکم گاڵتە کردبوو، دوو سێ کەلیمەی، ڕەنگبێ، دەگەڵ ویقاری (ئەلفەکە بە شیوەیەکی گاڵتە ئامیز دریژ دەکاتەوە. ف) سیاسییەکی نەگرتباوە، لییان فریداوە.

—ئیستە کە ئەندامی پارتی نیت، یا ئەندامی پارتییەك نیت، زۆرتر باسی سیاسەت و باشتر باسی سیاسەت دەکەی. ئەودەم بۆ نەتدەکرد..؟! لە تاریك و ڕوونیشدا وات نەگوتوە، یا پیشانت نەداوە کە سانسۆری حیزبیش و کوردایەتیش تەئسیری لیکردووی..

—ئەوەش هەر سانسۆری حیزبە کاکە (پیدەکەنێ)، مەگەر تاریك و ڕوون کێ بڵاوی کردۆتەوە؟! حیزب بڵاوی کردۆتەوە، خۆ من بڵاوم نەکردۆتەوە.

—ئەی ئیستە چۆن سەیری تەجروبەی سیاسی خۆت دەکەی؟!

—قەرار وا نەبوو لە سیاسەت قسە نەکەین..؟!

—نا.. مەبەستم ئەوە نییە بە دریژا باسی بکەی، تەنیا وەك یەکێ لە تەجروبەکانی، سەرچاوەکانی شیعر لای تۆ. هەلبەتە سیاسەتیش دەوریکی بینیوە. ئیستە چۆن سەیری ئەو ژیانە دەکەی کە لە سیاسەتدا بردوتەتە سەر؟!

—وەڵلاهی من ئەلعانیش بەجیی شانازیی خۆمی دەزانم، چونکو پیموایە کورد هەر بە شیعر ڕزگاری نەدەبوو.. لە ڕژیمی تاغوتیدا، پیم وابوو کە دەبوو سیاسەتیشی بۆ بکەی، حەتتا چەکداریشی بۆ بکەی. وە لە شەری سێ مانگەی لەگەڵ لیبرالیزم و بەنی سەدردا من چکداریشم کرد، بەو پیرییەی خۆمەوە. ئەلعان بەردە هیمن مەشهورە، کە لەبن بەردیکی دانیشتو و هیلیکۆپتەرم وەبەر تفەنگان داوە. بە دەست و تفەنگیش خویری نیم، ئەمما پیم وابوو بە نەفعی ئیمپریالیزم کورد نابێ دەست بداتە چەك ئیدی. من دەو بروایەدام، ئەلعانیش هەر دەو بروایەدام کە ئیمپریالیزم دەیتوانی لە شەری ئەوەلی جیهانیدا کوردستانێ بە وجود بینێ، زۆر بە ئاسانی دەیتوانی، نەیکرد، بە تایبەتی ئەو ئیمپریالیزمەی کە ئیمە دەمانگوت قەتمان تاقی نەکردۆتەوە، یانی ئیمپریالیزمی فەرەنسە، کە بە حالەتیکی برا کوردەکانی سوریەمان بە لەش و خوین و هەموو شتیکی خۆیانەوە ئیحساسیان کردوە. تاریخ نیشانی داوە ئەگەر ئیمپریالیزمی فەرەنسە یاریدەی کەمال ئەتاتورکی نەدابا، بەو زوانە شۆرشی کوردی تورکیەی دانەدەمرکایەوە. ئیمە چۆنمان هیوا بەوەی بێ. ئەوەیە کە من، ڕاستییەکەی، وەکو ئینسانیکی دژی ئیمپریالیزمی ئەلعان لە سیاسەتدام.

—ئەوجا با بچینە سەر شیعری کلاسیکی کوردی یا هەر ئەدەبی کلاسیکی کوردی..

—بەلێ.

—چەند شارەزاییت لیی هەیە؟

—بەلێ، وەڵلاهی هەر لە پیشداش گوتم من کلاسیك نالیم، کاکە، چونکو.. من دەلیم عەروزی، کۆن، نازانم.. هەرچی دەلێ.. وەڵلاهی زۆر شارەزام من.

—کلاسیك کە دەلیم، لیرەدا مەبەستم تەنیا شەکل یا بلیین فۆرمی شیعر نییە بەلکە هەر وەك قۆناغیکی تاریخی ناوی کلاسیك دەبەم.. هەر ئیمەش نین، میللەتی دیکەش هەموو وان..

—ئیمە دوو نەوعمان ئەدەب هەیە، بە ڕاستی.. ئەدەبیات، شیعر هەیە.. نابێ بلیین ئەدەبیاتمان هەیە بە تەواوی مەعنای کەلیمە.. دوو نەوعمان ئەدەبیات هەیە، نوسراو و نەنوسراو، یانی ئەوانەی کە پییان دەلین فۆلکلۆر، یا ئەوانەی وەك شاعیرەکانی لە جەزیری، فەقیی تەیران و لە جزیررا دییە خورایێ.. ئەگەر ئەوانە دەلیی من شاعیری زۆر گەورە دەنیو وانەدا دەبینم. ئەگەرچی زۆر چاك لەهجەی گۆرانی نازانم من -با ئەو حەقیقەتەش بلیم-، بەڵام وەختیکی بەراوردیکم کردوە لە بەینی شیرین خوسرەوی خانای قوبادی و نیزامیدا، هیچ بە کەمی نازانم لە نیزامی، لە نیزامی بە کەمترم نایەتە بەرچاوی. وەختیکی مەم و زینی لە موقابیلی یەکیك لە پینج کتیبەکانی نیزامیدا دادەنیم، ئەگەر مەم و زین دە موقابیلی لەیل و مەجنوونی کە هەر لەسەر ئەو وەزنە دانراوە، موقابیلیان بکەین، ئەمن پیم وایە لە باری مەعناوە مەم و زین چیترو فەیلەسوفانەترە. وە بۆیەش زۆری بە موەفەق دەزانم قارەمانەکانیشی کوردن، سەحنەی داستانیشی هەر کوردستانە، فەرهەنگ هەر فەرهەنگی کوردییە، داب و ڕەسم هەر داب و



رەسمی کوردییە، بەڵام نیزامییەکی لە گەنجەیرا دەچێ بۆ خۆلی عەرەبستانی نەیتوانیوە ئاداب و روسومی عەرەب وەکو عەرەبێك بەیان کا. دیارە فارسییەکەی زۆر ریك و دروستترە لە کوردییەکەی خانی. دەگەرێینەوە بۆ ناڵیو مەحویو ئەوانە، بە راستی پیموایە شاعیری زۆر گەورەن، وە زۆرم ئیمان پییانە.. شاعیرەکانی قەرنی بیستوممان..

—ئەی شیخ رەزا..؟!

—وەڵلاهی کاکە، شیخ رەزا بە راستی نازیمیکی چاکە..

—نازیم..؟!

—نازیم، فەرقی هەیە بە عەقیدەی من. یەعنی توانیویەتی وەزن و قافیەو قالبی زۆر جوان دروست کا، بەڵام شیعرەکانی سەرفی نەزەر لەوەی هەجون، تەنز نین.

—ئەی ئەوە، بە رەئی تۆ، تازە نییە؟! شتیکی تازە نەبوو لە ئەدەبی کوردیدا؟!

—نەخێر.. دە ئەدەبی کوردیدا تازەن، بۆچی..

—ئەی زمانی شیخ رەزا، بۆچی پیاو باسی ئەوەش نەکا..؟!

—ئای.. زۆر، زۆر.. بە راستی رەوانە..

—زمانیکی زۆر سوارە..

—زۆر رەوانە.. زۆر سوارە.. عەرزم کردی، من لە باری وەزندا شیخ رەزای زۆر بە گەورە دەزانم، وە لە باری وەیدا کە تەعبیری کوردانەیشی هیناوەتە ناو شیعری خۆیەوە، کە لە پیش ویدا دیارە لە شیعری نالیدا کەم تا کورتیك دەبینرێ، لە بیرت نەچێ، بەڵام:

کارێ کە غەم و دەردی فەراقت بە منی کرد
سەرما بە هەتیو با بە دەواری شری ناکا

ئیدی کوردی کوردییە. لەبەر وەی من شیخ رەزاشم.، بەڵام بە داخەوە شیعرەکانی زۆریان رووی مەجلیسیان نییە ئیدی.. دەلیی چی.. تو خوداکەی.. ئەوە لەکن خۆمان بێ ئینشائەڵلا، خۆ ئەوەی بۆ هەموو کەس لی نادەی.. رۆژیکی کچەکانی تەلەبەی بەشی کوردی دانشکەدەی بەغدا هاتنە لام هەموویان پیدەکەنین..

—جا کوا کچمان هەبوو..؟!

بەدی، سێ چواریکمان هەبوو..

—نیویان لە پیاو دەچوون.

—ها ها.. وا.. هاتنە لام، پیدەکەنین سەیر. گوتم بە چی دەکەنن؟! گوتیان وەڵلا مامۆستا عەلائەدین سەجادی ئەورۆ لەسەر دەرس باسی شیخ رەزای بۆ کردووین و ئەو شیعرەشی بە نموونە خویندۆتەوە:

بەو جووتە گونە من کە دەلیی عەنتەری نیرم
لیم لادە نەوەک بتخەمە بە رحەملەیی کیرم

دەیگوت مامۆستامان بۆ خۆمان وەك عەنتەری نیر هاتبوە بەرچاو (هەموومان پیدەکەنین).. هەموو پیدەکەنین، بە راستی ئەگەر لە بیرت بێ رەنگبی، مامۆستا ئەگەر رووتت کردباوە، رەنگبێ لە شتیکی سەیری بکردایە.. بەلێ.. شیخ رەزا، بە داخەوە، شیعرەکانی، بلیم چی، بۆ پیکەنین دەبن، بۆ خۆشی دەبن. بەڵام کاکە، شیخ رەزا، ئەو کەسەی شارەزای ئەدەبی فارسی بێ، زۆر شاگردی عوبەیدی زاکانی بوە، زۆریش لەوی شاعیرتر بوە، یانی، موسەللەتر بوە بەسەر وەزن و قافیەو.. بەڵام ئی شیعری عوبەیدی زاکانی لە عەینی حالدا کە جنیوی داوە، کە هەجوی کردوە، نەتیجەیەکی موسبەتی لە شیعرەکانی وەرگرتوە، بە داخەوە شیخ رەزا هەر جنیوی داوە، بۆ خۆت دەزانی.. ئەم جنیودانە وەنەبێ بۆیە بووبێ ئیسلاحی جامیعەی پیبکا. دەنا حاجی قادری کۆییش جنیوی گەورەیە، بەڵام هیمن لە مەقابیلی وەیدا دەلێ: وەکو بالێ پەری پاکە جنیوت.. چونکو جنیوەکەی موسبەت بوە. لەبەر وەی نەقدەم لە شیخ رەزا هەیە.. وە پیموایە، با ئەوەش دەربارەی شیخ رەزادا بلیم: هیچ کوردیك لە شیخ رەزای، ئەلعانیش، فارسی چاتر نازانێ..

—فارسی؟

—بەلێ.. بە عەقیدەی من، ئەلعانیش، لەو کوردستانە ئیرانەیدا، کە هەموومان بە فارسیمان خویندوە، هیچمان ناتوانین شیعری فارسی وەکو وی بلیین. مەحەشریکە لە شیعری فارسیدا کە پیاو هەر سەری..تەعەجوب دەمینێ. ئەلبەتە من دەگەڵ فیکرەکەی یەك نیم، بەڵام تەماشای ئەو دوو شیعرە، دەلێ:

رسم فرنگیان کله از سر فکندن است
تعظیم چون کنند خداوند جاه را
من اکتفا بشیوهء ایشان نمیکنم
هم سر به پایت افکنم و هم کلاه را

کە رەنگبێ شاعیرە مەداحەکانی فارس بۆ خۆیان مەدحی وای پادشایان نەکردوە، ئەمما پیم وایە هیچی نەداوەتێ چونکو کورد بوە.. (پیدەکەنێ).. بەلێ..

—ئەی مەلای جەزیریت پیچۆنە؟

—وەڵلاهی کاکە، تو خواکەی من شتیکی نەزانم بۆ دەبێ زۆری.. من کرمانجی وا نازانم.. حەتتا کاك هەژارم ئینتیقاد کرد، کە تۆ دەلیی ئەوە لەگەڵ مەولانای رۆمی هاوشانە.. پیموایە بریك زیدەرەویت کردوە لەوەیدا. بە راستی شیعریکی بۆ خویندمەوە کە من موتەوەجیهی نەبووم. ئەلعانیش لە بیرم نییە، هۆوەتا دیوانەکەشی، بە داخەوە فرسەتی وام نییە تەماشای بکەم، بۆم نابینریتەوە. تەماشام کرد بە راستی عارفیکی گەورە بوە. رەنگبێ جەلالەدین شیعری وای نەبوە. کەوابوو هەژار بە خۆرای هیندەی پیاهەلنەگوتوە، بەڵام ئەوەی ئەگەر مامۆستایەکی کرمانجی چاتر دەزانن لە من، ئەگەر بەوان بلیی.. من گۆرانی چاتر دەزانم لە کرمانجی. بە راستی لە کرمانجیدا زۆر کۆلم.. ئەگەر عەرزت دەکەم بریك لە خانیدا شارەزاترم ئەوەیە کە ئەوەڵا زۆر پترم خویندەوە.. دە بیکاریدا توانیم مەم و زین چاکتر بخوینمەوە.

—بە کرمانجییەکەی یا ئەوەی هەژار؟

—بە کرمانجییەکەی. هی هەژاریش یارمەتی دام، پیاو حەق بلێ، ئەویش یارمەتی داوم ئیدی. وەختیکی شیعریکی تینەگەیشتوم چووم تەماشای هەژارەکەشم کردوە. تەماشام کردوە، ئەگەرچی، ئەگەر تەماشای پیشەکی توحفەی موزەففەری بکەی هەژارم نەقد کردوە کە نەیتوانیوە فەلسەفەکەی خانیمان پینیشان بدا.





ئەم رۆژانەش توشی ئەدیبیکی زۆر گەورەی کورد بووم بە نیوی سەیید تاهیری هاشمی، کە ئیوە نایناسن.. بە راستی گەورەیە. بە راستی زۆر گەورەیە. ئەو، حەتتا ئینتیقادی لە مامۆستا مەلا کەریمی بوو کە بە خۆرایی شەرحی لەسەر نالی کردوە. دەبێ شاعیر لیی گەریی، هەر کەسە، وەکو دەریایك، بەشی خۆی لیهەلینجینێ. حەیفە.. حەیفە ئەو کەسەی لە نالی ناگا، تیی بگا.. لیی گەری با تیی نەگا.. بە راستیش ئەوەندەی جوان فەرموو. حەتتا لەسەر مەلای جەزیری کاك هەژاریش ئەو نەقدەی هەر هەبوو. دەیگوت مامۆستا هەژار دەبوو ئەو کەلیمانەی بۆ ئیمەی گۆران موشکیلە بۆمان بکاتە فارسییەك، یا کوردییەکی سۆرانی، با تیی گەیشتباین. ئیدی لازم نەبوو ئەو شەرحەی لە سەر بکا. ئەو عەقیدەی وایە..

—سەیید تاهیری هاشمی..

—بەلێ.. بە راستی ئەدیبیکی گەورەی کوردە. ئەدەبناسیکی گەورەی کوردە.

—رەخنەگریکی باشیشە وا بزانم..

—رەخنەگریکی باشە..

—وتارەکانی لە رادیۆی کرماشانەوە دەیخویندنەوە شتیکی بە راستی نایاب بوون. بەلێ. عەرزت دەکەم، ئەوجار کتیبخانەیەکی زۆر عەزیمی کوردی هەیە. دەیگوت پتر لە بیست دیوانی مەولەوی..

—دەستنوس مەبەستت..

—دەستنوسی هەیە. بەلێ، وە دەیگوت وەختیکی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس خەریکی مەولەوی بوو، لە منی نوسی کە ئەتۆ عەقیدەت چۆنە. بنوسە، ئەو شتانەی کە مەشکوکی هی مەولەوین، یاهی مەولەوی نین. گوتی وەڵا هەمووم بۆ نوسی، بە داخەوە هەمووی چەپ کردوە (پیدەکەنێ).. گوتی ئەوەی ئیوە لە سروەتاندا چاپ کردوە —ئیمە بە هاریکمان لە سروەدا چاپ کردوە— گوتی ئیتیفاقەن ئەوە یەکیك لەوانە بوو کە ئەمن بە مەشکوك پیم موعەرەفی کردبوو. وە من دلم نەهات دەو مەجلیسە خوسوسییەیدا بلیم کتیب لە عیراقدا هەتا ئەستورتر بێ پتری پول لیوەگیر دەکەوێ. دلم نەهات ئەوەی عەرز بکەم (پیدەکەنێ)، بەلێ، گوتی، زۆریان بە مەشکوك دەزانم ئەوی ئەو هەیەتی. من شتی چاترم هەیە. وە ئەوەی کە ئیمە لە سەفحەی دوەمی..

—سروە،

—سروەدا نوسیومانە: هەر چەن مەواچان..

—ئەوە هی خانای قوبادییە..

—خانای قوبادییە، خەلك بە نەوعی دیکەی بۆ ناردوین: مەحزوزەن هەر کەس وە زوان خویش، ئەو دەلێ: دلشادەن.. عەرزت دەکەم، دەلین (ئەو رەنگ) وای دروست کردوە. ئەوەمان لە زمانی مامۆستا تاهیری بیستوە، دەلێ من دەستم لینەداوە، وەرن نوسخە ئەسلییەکەتان پینیشان دەم، خۆی وای نوسیوە. ئەم کەسانەی تەسەروفیان تیدا کردوە پاش وی تەسەروفیان کردوە..

—ئەی مەولەوی..؟! سەید عەبدولرەحیم.

—بەلێ.. سەید عەبدولرەحیمیش هەر ئەو چاکی دەزانێ.

—نا، مەبەستم وەکو شاعیریك چۆنی دەبینی؟

—من زۆر بە گەورە دەزانم. زۆر سەیرە. بارەها، لە بیرتە، کە لە عیراقیش ئەگەر دەیانگوت بە موناسەبەتی، مەسەلەن، وەفاتی (ئەلفەکە بە شیوەیەکی گالتە ئامیز دریژدەکاتەوە. ف) تەوفیق وەردی شیعریك بلێ (پیدەکەنێ)، من شیعرم بۆ نایێ بە موناسەبە، دەمگوت من شاعیری موناسەبات نیم، کەچی ئەم کابرایە هەموو شیعرەکەی موناسەبەتە، کەچی دە هەموویدا، بۆ خۆت دەزانی، گەیوەتە ئەوج، پیموایە..

—راستگۆ بوە، ئەوەیە مەسەلە..

—بەلی زۆر راستگۆ بوە..

—بەلام رەنگە لە هەمووی جوانتر ئەوانە بن کە بۆ عەنبەر خاتونی نوسیون؟!

—پەك، پەك، پەك، پەك.. بەلێ، بەلێ، پیموانییە.. دیارە لە بیرت نەچێ کە، نازانم شیعری کامەیانە، پیش وی، حەماغای دەربەند فەقەرەیە، نازانم چی، کە ئەویش لەسەر گلکۆی تازەی لەیلی..

—ئەحمەد بەگی کۆماسی..

—کۆماسی بێ، یا نازانم، بەلێ.. گلکۆی تازەی لەیل دە پیش عەنبەر خاتوندا گوتراوە. ئەگەر ئەوە نەبا، یانی ئەوەشمان لە ئیختیاردا نەبا، دەبوو بە قەتعە شیعریکی عالەمی ناسرابا، بە راستی پیموانییە کەس شینی بۆ خۆشەویستی خۆی وا گیرابێ، وەك ئەو دووانە هەردووکیان گیراویانە. هەردووکیان زۆر چاکن.. بەلێ.. خۆشەویستی عەنبەر خاتونی هەر لە مەرگەکەیدا دیار نییە. ئیدی، لە نەخۆشییەکەیدا کە جەرگی بۆ دەکاتە، دلی بۆ دەکاتە هەنار دەلی کون کونی کەو بۆنی پیوە کە، هەنار بۆ هەلامەت..

—ئەویشی هەر بۆ عەنبەر خاتون نوسیوە؟!

—بەلێ. ئەویشی هەر بۆ عەنبەر خاتون نوسیوە.. بەلێ.. نەخیر، شتیکی سەیرە. باوەر بفەرموو شیعریکمان.. قەرار وایە مامۆستا تایەر بۆمان بنوسێ، ئەگەر ئینشائەللا سروە گەیشتە فەسلی زستانێ. بۆی خویندینەوە، مەفهومەکەم لە بیرە ئەگەر شیعرەکانم لەبیر نەبن، مەفهومە، بۆ خۆت دەزانی، کە.. ئەگەر بیکەیە زبانیکی دیکەش ئەو تام و بۆنەی هەر هەیە، دەلی زستانەو عوزری هەیە بۆ دیتنی.. بچیتە خزمەت شیخەکەی، شیخ سەراجوددین زستانە. ناتوانم بیم، پیرم، نازانم چم، ئەمن ناتوانم بیم، بەفر ریگای گرتوم، بەلام ئەو کەسانەی شەوقی زیارەت زۆری بۆ هیناون، من ریگایەکیان پینیشان دەدەم زۆر بە ئاسانی برۆن بۆلای وی، ئەویش ئەو ریگایەیە کە هەناسەی من بۆ خزمەت شیخ کردویەتیەوە، رەشانگە.. هیند گەرمە هەناسەکەم بە رەشانگەکەیدا برۆن دەگەنە تەویلە.. ئایا تا ئیستا فکری وا ناسکت.. پیموایە زۆر کەم هەیە. لەسەر زستانی ناشیرینی چەند جوان.. ئەوی کردووی.. بەلێ..

# "ساقی نامەی ناڵەی جودایی"

لە مێژووی ئەدەبی ڕۆژهەڵات، بوێژو شاعیری ناودار هەن کە لە سایەی تاکە بەرهەمێکی ئەدەبی، ناویان لە تۆماری مێژووی ئەدەب ماوەتەوە، لای عەرەب ئەمانە بە (شعراء الواحدة) یاخود (اصحاب الواحدة) ناودەبرێن، هەندێ لە شاعیرانی کوردیش، ناوونباوبانگی ئەدەبیان بە تاقە هۆنراوەیەکی بەرزو ناوازەوە بەستراوەتەوە، لەمانە دەشێ نێوی ئەمانە وەکو نموونە بهێنینەوە:

–عارف سائیب (1889–1923) و شیعرە ناودارەکەی (شەکوای حاڵ) کە بەم دێرە دەست پێدەکات:

ئاوارەی خاکی وەتەن و سەیروسەفا خۆم
پامالی غەم و غوربەت و سەد دەردو بەلا خۆم[1]

–قەسیدەی (عیتاب)ی شێخ محمدی خالیسی تاڵەبانی (1874–1928). بۆ شێخ مەحمودی حەفید:

لە پاش داوێن و پا ماچ کردن و عەرزی دوعا خوانی
وەرین دەست پێدەکا بەچکەی گەماڵی پیری گەیلانی[2].

–شیعری شاکاری (دیاری) شوکری فەزلی (1882–1926) بۆ شێخی نەمر:

ئیش کە ڕووی ئیستە لە هەورازە سەرەو لێژی نەکەی.
فکری وردیشی ئەوێ هەر بە دوعاو نوێژی نەکەی[3].

(ناڵەی جودایی) شاکارێکی ئەدەبی درێژەو (110) دێڕە، هێمن دەردی غوربەت و ناڵەی دەرونی تیادا خستۆتە ڕوو. ئەگەر هات و هێمن تەنیا ناڵەی جودایی هەبوایە، تەبای ئەو ناودارانەی عەرەب و کوردو فارس، بەسی بوو بۆ ئەوەی ناوی بە زیندوویی و دەرەوشاوەیی لە دڵی مێژوودا بهێڵێتەوە[4]. بەو پێیەی هێمن شارەزاییەکی چاکی لە ئەدەبی فارسیدا هەبوە، بۆیە شاعیرانی گەورەی فارس، لە وێنەی سەعدی، حافز، نیزامی، بە تایبەت مەولانا جلال الدینی ڕۆمی بەڵخی (1207–1273) کاریگەری گەورەیان بەسەر هۆش و هەست و هۆنراوەکانیدا بەجێهێشتوە. (ساقی نامە)، بابەتێکی شیعری باوی نێو ئەدەبیاتی کۆنی فارسییە، کە تیایدا شاعیر ساقی دەهێنێ‌و دەیکات بە هاودەم و (سەنگی سەبوور)ی خۆی‌و تەواوی دەردو خەم و ناڵەو ژانەکانی خۆی لە تەکیدا دەردەبڕێت. لە ئەدەبی فارسیدا کۆمەڵێك ساقی نامەی ناودار هەن، کە دەدرێنە پاڵ شاعیرانی وەکو حافز (سەرەتای سەدەی 14–1389)، وەحشی بافقی کرمانی (1583–1643). مەولانای ڕۆمی.. و لە کتێبە ناودارەکەی (تذکرة آتشکدە)ی، آذری بافقی. (1719–1780) تۆمار کراون، کە لە ئەدەبیاتی ڕۆژهەلات بە (مەسنەوی) ناودەبرێن[5]. ئەوەی پەیوەست لەگەڵ ساقی نامەکەی (ناڵەی جودایی) هێمن و بۆ ئێمە مەبەستە، (مثنوی معنوی) مەولانا جەلال الدینی ڕۆمییە کە بریتی‌یە لە (26) هەزار بەیت و لەسەر کێشی (ڕەمەلی موسەدەسی مەحزوف) هۆنراوەتەوە[6]. کە بە پێشەکییەکی (35) دێڕی‌و بە جیاوازی لەگەڵ مەسنەویە نێودارەکانی دیکە کە بە (بەسمەلە) دەست پێدەکەن، دەسپێکی ئەم پێشەکییە ئەم دێرەیە[7]:

بشنو ازنی چون حکایت می کند
ازجدایها شکایت می کند

وەك دەگوترێت هەموو کتێبەکە، واتە (مثنوی معنوی) کە لە زنجیرەیەك چیرۆك و سەربردەی ئاینی‌و عیشق و عیرفان پێکهاتوە لە شەرحی ئەم پێشەکییە دایە[8]. وەك لە درێژەی ساقی نامەی (ناڵەی جودایی)دا دەردەکەوێت مەسنەوی مەولانا زۆر کاری لە شاعیر کردوەو لە ناخەوە هەژاندوویەتی، بۆیە بۆ دەربڕینی سۆزو سکاڵای غوربەت و دەرونی، پشتی پێبەستوەو لە چەند شوێنیش ناڵەی دەرونی پڕ زوخاوی تێکەڵ بە ئاهو هەناسەی مەولەوی کردوە. ئەم پێشەکییەی مەسنەوی بەلای هێمنەوە لە وێنەی موعجیزەیەکە، کە ئەو خۆی تیادا بەند کردوەو هەموو خەم و بەدبەختی‌و بێچارەیی خۆی‌و میللەتەکەی تیادا دۆزیوەتەوە[9]. مەولانا ئەگەر هەناسەی عەشقی دەروونی پڕ لە ڕازو نهێنی خۆی تێکەڵ بە بانگ و ناڵەی (نەی) کردبێت، ئەوا ئەم ناڵەی تێکەڵ بە هاواری مرۆڤایەتی دەکات:

شیوەنی من شیوەنی ئینسانی‌یە
بانگی ئازادی‌و گروی یەکسانی‌یە

شاعر هەڵبڕاوو دوور وڵاتە، کاتێك لە غەریبیدا دەسوتێو فرمێسك بەربینگی پێدەگرێ، پەناوەبەر (مەی) و (ساقی) دەباو دەبێتە موشتەری (مەیخانە):

ساقیا وا بادەوە وا بادەوە
ڕوو لەلای من کە بە جامێ بادەوە
موشتەری وەک من لە مەیخانێ کەمن
زۆربەیان شادو بە کەیف و بێ خەمن

مەی لە لای هێمن ((دوکەڵکێشە، پەژارەو خەمە پەنگ خواردوەکانی ناو دەرونی لێوە سەردەکەن.. ئەنجا خەیاڵێکی خۆشیش بە شاعیر دەدا، کە بەو خەیاڵە بۆ شایی‌و ناگزوریەکانی دەرونی پڕ دەکاتەوە))[10]:

ئەم شەڕابە تاڵە دەرمانی خەمە
لێی حەرام بێ ئەو کەسەی دەردی کەمە
ئەم شەڕابە ئاڵە بۆ بێ دەرد نی‌یە
لێی حەرام بی ئەو کەسەی ڕەنگ زەرد نی‌یە
بۆ کەسێکە مەی: کە دەردی کاریە
بێ خەمێک بیخواتەوە زۆرداریە
بۆ کەسێکە مەی: دڵی پڕبێ لە داخ
بۆچی لێی بخواتەوە بەرزە دەماخ
ئەو کەسەی بێ‌کەس نی‌یەو خانە خەراب
دەک بە ژاری ماری بێ بادەو شەراب

مەی دەبێ هەر تاپۆی هێمنی تەنیا باڵ و خانە وێران و دڵ سوتاو بێت، بۆ خەڵکی کە دەست نادات، دەیەوێ بادەگێڕ لەم ڕازە بگات:

ساقیا وا وەرگەڕێ، وا وەرگەڕێ
ڕوو لەلای من کە، مەچۆ بۆ سەرپەڕێ
لەنگەرێ بگرە، مەبە وا بەرزە فڕ
بێنە بۆ من، بێنە بۆمن، جامی پڕ
مەی حەڵاڵە بۆ منی وێرانە ماڵ
بۆ منی سەرگەشتەوو ڕووت و ڕەجاڵ

لە خوێندنەوەی ناڵەی جودایی، مرۆڤ هەست بە هێزێکی شاراوە دەکا وەکو هێڵی بەیانی بەرزو نزمی دەکاتەوە، سۆزو ئەندێشەکان، کزەو کسپەو بۆ کروزی ئەو وێنە جوان و چڕانە، وەکو مۆسیقایەکی ماتەم دەخزێتە ناخەوە، جگە لە کێش و سەرواى شیعرەکە، ریتم و ئاوازەکان بەپێی دابەش بوونی نەغمەکان بەرزو نزم دەبنەوە، تێکەڵاو دەبن، جیا دەبنەوە دیمەنێکی نامۆو ئاوارەی ژان و ژوورو خۆشی‌و لەزەتێك سازدەکەن.

کە مرۆڤ لە کاتی خوێندنەوەیدا وەکو بازرگانی کەشتیەکی شەکەتی لێدێ. شاعیر تاوەکو مەست و کەلەلا نەبێت ئۆخژنی بەدڵدا نایەت:

وا وەرە، دەی وا وەرە، نزێك بە لێم
بمدەیە مەی، بمدەیە مەی، تا دەڵێم:
((مست مستم ساقیا، دستم بگیر
تا نە افتادم زپا دستم بگیر!))
جا کە سەرخۆش بووم بە دەنگێکی نەوی
بۆت دەڵێم ئەو شیعرە بەرزەی (مەولەوی):
"بشنو از نی چون حیکایت میکند
از جدایها شکایت میکند))

بەوە شێوەیە شێوەنی شاعیر لەگەڵ شیوەنی نایەکەی مەولەوی تێکەڵاو بوەو داستانێکی لە شۆڕو شەوق و حەماسە خوڵقاندوە

## پەراوێزەکان:


1-ئەمین فەیزی بەگ، ئەنجومەنی ئەدیبان، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد. 1983، ل 134.

2-شێخ محەمەدی خالیسی تاڵەبانی، قەسدیەی عیتاب، گ. خاك، ژ/2، 1999، ل 35.

3-عبداللە عزیز خالد،، شوکری فەزڵی، چ1، بەغدا، 1988، ل 29.

4-فەرهاد شاکەلی، سەرچاوەی پێشوو، ل 33.

5-محمد سعید نجاری (ئاسۆ)، هێمن، شاعر نالە جدائی، نامەی زانکۆیی دەستنوس.

6-مەولانا جلال الدین رۆمی بلخی (مولولی)، مپنوی معنوی، انتشارات گنجینە، تهران، 1374 ش

7-محمد سعید نجاری، سەرچاوەی پێشوو، ل 20.

8-دکتر محمد معین، فرهنگ فارسی، ج6، ص 1901.

9-فەرهاد شاکەلی، سەرچاوەی پێشوو، ل147.

10-محمد فریق حسن، سەرچاوەی پێشوو، ل 10.



# هێمنیش مرد(*)

جۆیس بلۆ

ئا: دەشتی

هێمنی شاعیری ناوداری کورد لە شەوی 18ی نیسانی 1986داو لە شاری ورمێ بە نەخۆشی وەستانی دڵ کۆچی دوایی کرد، بنەماڵەکەیان بێئەوەی گوێ بە قەدەغەی پۆلیس و پاسدارانی کۆماری ئیسلامی بدەن لە گۆڕستانی بوداغ سوڵتان بە خاکیان سپارد، لەناو ئاپۆڕەی خەڵکیدا لە مزگەوتی حاجی سەید بایەزیدو لە کاتی نوێژکردن لەسەر جەنازەکەیدا، جێگەیەکی بەتاڵ نەمابوو، مزگەوتەکانی سنەو ورمێو کرماشان؛ لە ڕۆژانی دواترو لە پرسەی گیانی ئەو مرۆڤەدا هەروەها بوون.

سەید موحەمەد ئەمینی شێخەلئیسلامی موکری، کە زیاتر بە نازناوی (هێمن) ناسراو بوو، لە ساڵی 1921 لە گوندی (لاچین)ی نزیک مهاباد هاتۆتە دنیا، سەید حەسەنی شێخەلئیسلامی باوکی هێمن یەکێك بوە لە نەوەکانی مەلا جامی چۆڕیو ئەو بنەماڵەیە سێسەد ساڵێك دەبێت کە لە مهاباد دەژین. (زێنەب)ی دایکی هێمن لە بنەماڵەی شێخی بورهانی ناوداری موکریانییە، ئەو ساڵەی هێمنی تێدا لە دایك بوو پیاوەکانی ئیسماعیل ئاغای سمکۆ هێرشیان هێنابوە سەر مهابادو شارەکە وەبەر تاڵان کەوتبوو، وەکو زۆر لە ماڵ و خێزانەکانی ئەو شارە، ماڵە باوانی هێمنیش شارەکە بەجێدەهێڵن و ڕوو لە دێهات دەکەن.

ئەو خێزانە حەوت منداڵیان دەبێت و بە گوێرەی تەمەن هێمن کوڕی دوەمینی ئەو ماڵە بوە. زۆرجاران هێمن بە تایبەتی دەیسەلماند کە تەمەنی منداڵی وی لەتەك (یاسەمین)ی دایەنیو (عیزەتی) لەلەیدا بە خۆشی گوزەراوە، ئەوان خەڵکی ئازەربایجان بوون و لەوانیش فێری زمانی تورکی بوە. سەعید ناکام یەکەمین مامۆستای هێمن بوە، ناکام ئەو نوسەرو ڕۆژنامەوانەیە کە سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی بۆ کوردی وەرگێڕاوە، لە پاشان باوکی ڕەوانەی خوێندنگای (سەعادەت)ی دەوڵەتی دەکات، لەوێ لەتەك مامۆستا فارسی زمانەکانیدا کە نە ئاشنایەتییەکیان لەگەڵ زمانی کوردیو نە لەگەڵ دابونەریتی کوردەواریدا هەبوە هێمن دوچاری جۆرێك لە دژواری دەبێتەوە کە هەرگیز لە بیری ناکات. لە تەمەنی سێزدە ساڵان باوکی دەینێرێتە لای شێخی بورهان کە زانایەکی ناوداری تەریقەتی نەقشبەندی بوو، خانەقای شێخ لە ناوچەی شەرەفکەندی کە دەکەوێتە نێوان مهابادو بۆکان هەڵکەوتبوو، ناوو ناوبانگی شێخی بورهان و خانەقاکەی سنوری کوردستانیشی تێپەڕاندبوو، لاوان لە هەموو لایەکی کوردستانی گەورەوە ڕوویان تێدەکرد، بێجگە لە فەقێیەکانی ئەوێ خوێندکارانی هیندی، ئەفغانی، تورك، تورکمان و فارسیش دەهاتن و لەژێر دەستی شێخدا دەیانخوێند.

ئەم تێکەڵاویو ئاشنایەتییە کاریگەرییەکی زۆر لەسەر هێمنی گەنج بەجێدەهێڵێ. گەلێ لە زانایان و گەورە پیاوان دەهاتن بۆ زیارەتی شێخی بورهان و لە خانەقادا دەمانەوە، لەگەڵ خوێندکارانیدا دەکەوتنە وتووێژو دەرسیان پێدەگوتن، بەو جۆرە هێمن کەسانی وەکو قازی موحەمەدی سەرۆك کۆماری کوردو سەیفی قازی شاعیرو زانای مەزن حاجی مەلا موحەمەدی شەرەفکەندیو ڕوناکبیری پێشکەوتوو عەلی خانی ئەمیری.. دەناسێت و کەڵکیان لێوەردەگرێت، بەڵام ئەوەی لە هەموان زیاتر کاریگەری بەسەر هێمنەوە هەبوە مەلا ئەحمەدی فەوزییە. هێمن لەبەر دەستی ئەو زاتە ئاشنایی لەگەڵ مامۆستایانی ئەدەبیاتی کوردی پەیدا دەکات، لە بەرایی لەگەڵ داهێنانی سەردەمی زێڕینی ئەدەبیاتی تەریقەتی سۆفیگەریو هەڵبەستی ئایینی ئاشنا دەبێت، لە وێنەی مەحوی نەقشبەندی (1830–1904)، مەلا حەریق (1851–1907) لەوەش زیاتر شیعرە نیشتیمانیو ئەڤینییەکانی نالی (مەلا خدری ئەحمەد شارەزووری 1797–1856) هەست و هۆشی داگیر دەکەن. نالی یەکەمین شاعیرە کە غەزەلو قەسیدەکانی خۆی بە زاری سۆرانی کوردی داناوە، دەستەڵاتێکی

باڵای بەسەر تەکنیکی شیعردا هەبوە، بەرهەمەکانی نموونەی بەرزی شیعرو هەڵبەستی کوردین. هەروەها شاگردی بلیمەتی نالی، حاجی قادری کۆیش (1816–1894) دەناسێ، کە شیعرەکانی بە ناوەڕۆکێکی کۆمەڵایەتیو زمانی سادە ناسراون و هەندێ لە دێڕە شیعرو هۆنراوەکانی بونەتە پەندو کەوتونەتە سەر زارانەوە. وەکو چۆن ئاشنای شیعرە هیجاییەکانی شێخ ڕەزای تاڵەبانیش (1832–1909) دەبێت. لەناو شاعیرانی دڵخوازی ئەویش دەشێ ناوی عەبدوڵا بەگ ببەین، کە بە میسباحودیوانی (ئەدەب) ناودێر دەکرێت، شیعری (ئەدەب) لە لایەنی ئەدەبیو ئیستاتیکیەوە زۆر دەوڵەمەندە کە نوێنەرەوەی ئەڤینی خۆیو ژنەکەیەتی، هەڵبەستەکانی سەرشاری ئەڤینێکی بەخوڕو تا ڕادەیەکیش لە دەرەوەی دابونەریت بوون.

لە حەڤدە ساڵیدا هێمن دەست لە خوێندن هەڵدەگرێت و



دەگەڕێتەوە ناو خێزانەکەی لە شیلاناوێ، لەگەڵ دژوارییەکانی ژیانی گوندنشینیو ڕەنجبەریش هێمن دەستبەرداری گۆڤارو کتێب نابێت، دوابەدوای بە کۆتاهاتنی کاروبارەکانی لە باخ و مەزرا، دەگەڕایەوە ماڵ و دەچووەوە لای کتێب و نوسینەکانی.

لە 16ی ئۆگستۆسی 1942دا کاتێك جوڵانەوەی نهێنی کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان پێك دێت بە پشتگیری عەبدولڕەحمانی زەبیحی، تەبای زۆرینەی هاوڕێکانی دەبێتە ئەندامی کۆمەڵەو نازناوی نهێنی (هێمن) بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت، هۆنراوە ناودارەکەی لەو سەروبەندەدا دەنوسێت:

## کوردم ئەمن

گەرچی تووشی ڕەنجەڕۆیی‌و حەسرەت و دەردم ئەمن
قەت لە دەس ئەم چەرخە سپڵە نابەزم کوردم ئەمن
ئاشقی چاوی کەژاڵ و گەردنی پڕخاڵ نیم
ئاشقی کێوو تەلان و بەندەن و بەردم ئەمن
گەر لە برسان و لەبەر بێ بەرگی ئیمڕۆ ڕەق هەڵێم
نۆکەری بێگانە ناکەم تا لەسەر هەردم ئەمن
من لە زنجیرو تەناف و دارو بەند باکم نییە
لەتلەتم کەن، بمکوژن، هێشتا دەڵێم کوردم ئەمن

یەکەمین شیعری هێمن لە ساڵی 1943داو لە ژمارەی دوەمینی گۆڤاری (نیشتمان)، کە شێخ عەبدولەتیفی کوڕی شێخ موحەمەدی بەرزنجی لە لاجان دەریهێناوە بڵاوبۆتەوە، لە ژێرەوەیدا ناوی (م. ش. هێمن) نوسراوە. شیعرەکە دەنگدانەوەی چاکی دەبێت، باوکی هێمن کە چاوی بە شیعرەکە کەوتبوو چووبوە دڵیەوە، لە کوڕەکەی داوا دەکات ناوی ڕاستەقینەی نوسەرەکەی بۆ بدۆزێتەوە.

هێمن لە ماوەیەکی کورتدا دەبێتە ئەندامی دەستەی نوسەرانی نیشتیمان و شیعرە تازەکانی تیادا بڵاو دەکاتەوە، هەروەها هەندێ لە شیعرەکانی لە گۆڤارەکانی دیکەی کۆمەڵەدا، وەکو (ئاوات) بڵاودەکرێنەوە. هەر لەوکاتەدا شانۆنامە شیعرییەکەی خۆی (دایکی نیشتمان)[1] دەنوسێتەوە، ناوەڕۆکێکی سەرنجڕاکێشی هەبوو؛ ژیان و مێژووی کوردان، لەوێدا قارەمانەکان هەوڵ و خەباتیان لە پێناو ڕزگاری دایکی نیشتیمان و ژیانێکی سەربەستدا بوو، شانۆگەری دایکی نیشتمان سەدایێکی گەورەی نایەوە، بۆ ماوەی سێ چوار مانگان و لە هەموو شارو دێهاتی ناوچەی موکریان هاتە نواندن و نمایش کردن، لە هەموو شارەکانی دیکەی کوردستانیش بە حەسرەت بینینی بوون. بێگومان ئەم شانۆنامەیە لە بزواندنی هوشیاری نەتەوەیی ئەو خەڵکە ڕۆڵێکی مەزنی بینی، تەماشاکەران دەهاتنە جۆش و دەگریان، لە دواییش بە گەرمی لەسەر حاڵی کوردان دەکەوتنە دەمەتەقێ. دەسکەوتی ئەم شانۆنامەیە لە سەرووی هەموو پێشبینییەك بوو، لە سایەی ئەم داهاتەوە کۆمەڵە توانی چاپخانەیەك بۆ خۆی بکڕێت و لە مەهاباد دایبمەزرێنێت.

لە مانگی تشرینی 1945دا حیزبی دیموکراتی کوردستان لە مهاباد یەکەمین کۆنگرێسی خۆی دەبەستێ، قازی موحەمەد، کە پێشتر لەژێر ناوی نهێنی (بینایی) ئەندامی کۆمەڵە بوە بە سەرۆکی ئەم پارتە تازەیە دەستنیشان دەکرێت، هەر لەو بۆنەیەداو بۆ جاری یەکەم هێمن یەکێك لە هەڵبەستەکانی خۆی لە کۆڕی کۆنگرەدا بۆ خەڵکەکە دەخوێنێتەوە، ئەوانەی لەوێ دەبن سەریان سووڕدەمێنێت!، کاتێ پەی بەوە دەبەن کەوا سەید

موحەمــەدەمینی شێخەلئیســلامی کــە ڕووبــەڕوویان و لەســەر مینبـەری مزگـەوتی سـوور شـیعر دەخوێنێتـەوە، ئـەوە هێمنـی شـاعیری نیشـتیمانپەروەری خۆشەویسـتیان خۆیـەتی. کۆمیتـەی نەتـەوەیی حـیزب حـاجی بابــە شـێخ وەکـو سـەرۆکی خـۆی هـەڵدەبژێری‌و هێمـن ماوەیـەك دەبێـت بـە سـکرتێری ئـەو، بـەڵام پاشـان بـە تـەواوەتی خـەباتی خـۆی دەخاتـە پـاڵ کۆمسـیونی تـەبلیغات و دەبێتـە هاوکاری ڕۆژنامـەی کوردستان و گۆڤارەکـانی هاواری کـوردو هـاواری نیشـتمانی زانـای هێـژا عـەبدولڕەحمانی زەبیحـی (کە لـە سـەرەتای سـاڵی 1980دا لـە زیندانـەکانی عـێراقدا مرد)، هەروەها گروگاڵی منداڵان و هەڵاڵە، و شیعرو هۆنراوەکانی تیادا بڵاودەکرنەوە.

لـە سـاڵی 1946 کـوردی ئـێران لـە پارچەیـەکی وڵاتـی خۆیـان ئازادی خۆیـان بە دەست دێنن و هێمن چـاوودڵی بـە دامـەزرانی کۆمـاری مهاباد شـاد دەبێت، وڵاتپارێزانی کورد لەهـەر چـوار لای کوردستانەوە ڕوودەکەنە مهابادو کۆماری ساوا دەبێتـە نیشـانەی سـەرکەوتنی خواسـتی نەتـەوەیی هـەزاران سـاڵەی کـورد، کۆمـاری تازە نازناوی (شاعیری نەتەوەیی) بە هێمن و هەژار دەبەخشێ، کە هـەردووکیان بەوپـەڕی شـۆڕو فیداکارییـەوە لـە ڕووداوەکـانی ئـەو ڕۆژگارەی گەلی کورد بەشداری دەکەن.

هێمـن لەتـەك ئـەو کەسـانەی کـە لـە ژیـانی سیاسـی کـورددا ڕۆڵێکـی بـەرچاویان گـێڕاوە هەڵسـوکەوت دەکـا، لـە وێنـەی قـازی موحەمـەد، هـەمزە عـەبدوڵا، موسـتەفا خۆشـناو، مـیر حـاج، کـاك ڕەحمـــانی موهتـــەدی‌و قودســـی، هـــەر لـــەو ساڵەشـــدا (1946) ژن دەهێنێت،

بەڵام لـە مـانگی کانوونی 1946دا لەشکری شا هـێرش دەکاتـە سـەر کۆمـارو داگـیری دەکـات. سـەرکردەکان دەسـتگیر دەکـەن و هێمـن بـە دڵێکـی شکسـتەوە کارەسـاتی شـەهید کردنـی قـازی موحەمەدو سەدری قازی‌و سەیفی قازی لە بەرەبەیانی 31 ئاداری 1947 لە مەیدانی چوارچرا دەبینێت، هەر لەو مەیدانەی کە ساڵێك لەوەبەر دامـەزراندنی کۆمـاری لێڕاگـەیاندرابوو، ئـەو لەسـەر ئـەو ڕووداوە دەنووسێ:

زانا بوو کورد پەروەر بوو
پێشەوا بوو، ڕابەر بوو
هەر کورد نەبوو بەشەر بوو
خەمی خەڵکی لەبەر بوو
***
داخرا دەرکی ڕۆژنامە
شکاون نووکی خامە
کوردی نووسین حەرامە
دوژمن دەڵی بێتامە
دڕان کاغەزو دەفتەر
گیران شاعیرو نوسەر

بۆ هێمـن، هـەروەکو بۆ هاوڕێکانیشـی حەسـەنی مـەلا قزڵجـی، عەبدولڕەحمانی شـەرەفکەندی، عـەبدولڕەحمانی محەمـەد ئـەمینی زەبیحی، دەروپەك بۆ حەوانەوە نەمابوو، ئەو خۆی داوێتە قەڵادزێ لە کوردستـانی عێراق و پاشی ماوەیەك گـەلێ بیری خاك و وڵاتـی خۆی دەکا، بارودۆخەکەش کـەمێك ئـارام دەبێتـەوە، بۆیـە بـەرەو شیلاناوێ دەگەڕێتەوە لای خاووخێزانەکەی. لـەو ماوەیـەدا لەگـەڵ ئـەندامانی حـیزبی تـودە پـەیوەندی بـۆ برایـەتی گـەلانی ئـێران دەچڕێت:

کوردو ئازەربایجانی هەردوو داوایان ڕەوایە[2]
هەر بژین و پایەدار بێ یەکیەتی ئەم دوو برایە
هەروەها ڕەخنە لە ئاغاو بێگانان دەگرێ:
ئەوەی ئاغا بێ بێکارە
حەبوون و قەڵس و لاسارە
دزی‌و ڕێگرتنی کارە
ئەمن دەیڵێم و بێ باکم
لە شەرم و شوورەیی مردم
بە خۆم من چۆن بڵێم کوردم
کە ئاغا ئابڕووی بردم
ئەمن دەیڵێم و بێباکم[3]

لـە سـاڵی 1948 هـەوڵی تیرۆرکـاری شـا لـە زانسـتگای تـاران دەبێتـە بیـانو بـۆ قەدەغـەکردنی پارتــە سیاسـییەکان و شـاڵاوی ستەمکاری بۆ ماوەیـەکی درێـژ دەسـتپێدەکات، هێمـن بـە نـهێنی‌و بێدەنـگ ژیـانێکی کولەمـەرگی بەسـەردەبات. لـە سـاڵی 1968دا بڕیاری وازهێنان لە هەموو شت دەدات: کوردستانی ئێران و ماڵ و خـاووخێزان و خۆشـگوزەرانی، ئـاودیوی ناوچـەی پشـدەری کوردستانی عێراق دەبێت و لـەوێ لەگەڵ کۆنە هەڤاڵەکانی وەکو هـەژارو زەبیحـی‌و قـاسملو یەکدەگرێتـەوە. لـێرەوە بـۆ هێمـن دەورانێکی پڕ لـە داهێنـانی مـەزن دەست پێدەکـات، لـە گۆڤـارە کوردییـەکانی عـێراق شـیعرو لێکۆڵینـەوەکانی بڵاودەکاتـەوە، یەکەمین کۆمەڵە شیعری خۆی (تاریك و ڕوون) لە بەغدا لە 1974 بە چاپ دەگەیـەنێت. تێکستی بەیتەکانی ناوچـەی موکریـان کـە لـە کاتی خۆی ئۆسکارمان لە ساڵانی 1906 و 1909 لە بەرلین لە چاپی دابوون، وەردەگێڕێتە سەر ڕێنوسی عەرەبی‌و لەژێرناوی (توحفەی

موزەفەریـە)دا بـە شـەرح و پـەراوێزی زۆرەوە لـە دوو بـەرگدا لـە چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد چاپ و بڵاودەکاتەوە.

کوردانـی چەپگـەرای ئـێران بـە تێکڕایـی لـە بزوتنـەوەی شۆڕشگێڕانەی ساڵانی 1978—1979 کـە خانـەوادەی پەهلـەوی لـە تەخت هێنایە خوارو شای ناچارکرد ڕابکات، بەشداریانکردبوو. ئەوان بـە هیـوای کۆتایـهاتنی ستەمکاری بـوون. هێمـن سـایری بەرپرسـانی حـیزبی دیموکـرات و هـەموو وڵاتپـارێزانی کـورد گەڕایەوە بۆ کوردستانی ئێران، خەڵکی مهاباد بە ئاهەنگ و شایی پێشوازییەکی مەزنیان لە شاعیری ناوداریان کرد.

لـە دوای ئـەوەی ڕۆژانـی خۆشـی بەسـەرچوون، پێکهاتـە سیاسیەکان توند ڕەوانە کەوتنە نێو مەیدان، حیزبی توده (پارتی کۆمۆنیستی ئێران) لە حیزبی دیموکرات دەخوازێت کە خواستە نەتەوەییەکانی کورد بـەلاوە بنـێ و پشـتیوانی (لـە ڕژێمـی نـوێ و ئەنتی ئیمپریالیستی) تاران بکات. لە حاڵێکدا کوردەکان بەشی زۆری ناوچە کوردنشینەکانیان بە دەستەوە بوو، تامی ئازادیـان چێشتبوو، ئیتر بەوە ڕازی نەبوون کە لە وڵاتی خۆیاندا کەسانێکی دیکە بەڕێوەبەریان بکات و داوای (خودموختاری— ئۆتۆنۆمـی)یان دەکرد بۆ کوردستانی ئێران. حەوت کەس لە ئەندامانی حیزبی دیموکرات لەژێر نفوزی حـیزبی تـودەدا لـە دروشمـی ئۆتۆنۆمـی پاشـگەز دەبنـەوە کشـانەوەی خۆیـان لـە حـیزبی دیموکـرات ڕادەگەیەنن، کوردسـتان بـەجێدەهێڵن و دەچنـە تـاران. هێمنیش لەگەڵ غەنی بلوریان و موحەمـەد ڕەحیمی قازی لەتـەک (گروهـی حەوت نەفەری)دا دەبن.

دوابەدوای پێنج ساڵی پڕ لە ئارێشەو گێرەو کێشە، هێمن دێت و لـــە ورمــــێ نیشـــتەجێ دەبــــێ و ئینتیشـــــاراتی سەلاحەددین دادەمەزرێنێت.

شازادەو گەدای (مارك تۆین) وەردەگێڕێتە سەر زمانی کوردی و چاپێکی تـازەی دیوانـی نـالی و وەفـایی و دیوانـی حـەریق (کـە شاعیرێکی مهابادیە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیست ژیاوە)[4] ئامادە دەکات.

ساڵی 1979 کۆمەڵە هەڵبەستێکی دیکەی خۆی لە نامیلکەیەك بـە نـاوی (نالـەی جودایـی) چـاپ کردبـوو، لـە سـاڵی 1983دا (پاشەڕۆکی مامۆستا هێمن) کەوا کۆکراوەی وتارو لێکۆڵینەوەکان و هەڵبەستەکانی دواییەتی لە بەرگێکدا لە مهاباد بڵاودەبێتەوە.

خـۆی لـە وڵاتـی خۆیـدا ئـاوارە بـوو، ئـەو ژیانـەی کـە لـەناو گەلەکـەی خۆیـدا دەیگوزەرانـد گـەلێك بـەلاوە دژوار بـوو، هـەڵبژاردنێکی سیاسـی خراپـی لـە کـۆڵ داهـاتبوو!، هاوڕێکـانی لەناو حیزبی دیموکرات لێی دەگێڕنەوەو حاڵی دەکەن؛ کە ئەوان بە گەڕانەوەی بۆ لایان گەلێك شادو کەیفخۆش دەبن، بـەڵام لـەم میانـەدا نەخۆشـی زاڵـتر دەبێـت و هێمنـی شاسـواری قـاڵبوی بیروباوەڕی وەختی پێشوو لە ورمێ بە وەستانی دڵ لەگەڵ هەموو کول و حەسرەتەکانی سەردەنێتەوە، بەڵام شیعرە بە سۆزو ناسك و پاراوەکـــانی تـــا ســـەد ســـاڵی دیکـــەش لـــە دڵـــی نەوەکانی کوردا دەمێنن.

### پەراوێزەکان:

***ئەم وتارە بە قەڵەمی خانمی کوردناسـی نـاودار خـاتوو جۆیس بلـو، مامۆستای زمانی کوردی لە زانستگای پاریس و بـە زمـانی فەڕەنسی، لـە سەرو بەندی کۆچی دوایی هێمنی شاعیردا بۆ گۆڤاری (هیـوا) بڵاوکـراوەی ئەنستیتۆی کورد لە پاریس نوسراوە. کارمەندانی گۆڤارەکە وەریانگێڕاوەتـە سەر زمانی کوردی و بە زاری کرمانجی و پیتی لاتینی لە ژمارە (5)ی گوڵانی 1986ی هەمان گۆڤاردا بڵاویان کردۆتەوە.**

**1—سەبارەت بە شانۆنامەی (دایکی نیشتمان) هەرچی لەو وتارەدا هاتوە ڕاستە، هێمن خۆشی لەو پێشەکیەدا، کە بە ناونیشانی (لە کوێوە بۆ کوێ) بۆ دیوانی تاریك و ڕونی نوسیوە باس لە ڕووداوەکانی ئـەو ڕۆژگـارەو تیـاتری دایکـی نیشتمانیش دەکـات، بـەڵام نـەیگوتوە مـن نووسـیومە، لـە هیـچ سەرچاوەیەکی دیکەش ئەوە نەهاتوە، هێمن خۆی پارچە هۆنراوەیەکی بـەو ناوەوە هەیەو لە تاریك و ڕووندا بڵاوکراوەتەوە.**

**2—کوردو ئازربایجانی، ناونیشانی ئەو پارچە شیعرەیە کە هێمن لە ساڵی 1946دا لە بۆنەی مۆرکردنی ڕێکەوتنامەی هاوپەیمانێتی لـە نێـوان هـەردوو کۆماری کوردستان و ئازربایجان لە تەورێز نوسیوەتی.**

**3—ئەم پارچە هۆنراوەیە لـە سـەرەتای بونـە ئـەندامی کۆمەڵـەی هێمـن نوسراوە لە ساڵی 1945داو لە وەڵامی شـیعرێکی (فـانی)دا کـە لـە ژمـارە (3،4)ی گۆڤـاری نیشـتماندا بڵاوکراوەتـەوە، شـیعرەکەی فـانی بـەم ناونیشـانەیە: دەڵێم بیڵێم و نـاوێرم، کـەچی هێمـن بـەم جـۆرە وەڵامـی داوەتەوە: ئەمن دەیڵێم و بێباکم!.**

**4—حەریق (1851—1907) لە بنەچەدا خەڵکی ناوچەی سورداشی سەر بە شاری سلێمانییە، بەڵام پاشان بە فەقێیەتی بۆ خوێنـدن ڕوودەکاتـە مهابادو لەوێ جێگیر دەبێت.**


هێمن

# پاشکۆ/1/

## بیبلۆگرافیای ئەو وتارو لێکۆڵینەوانەی دەربارەی هێمن نووسراون بەپێی ناوی نووسەرەکانیان(*).

### یەکەم: کوردییەکان

**ئاکۆ عەبدوڵڵا**

1–**هەستی مێژوویی لە نوسراوەکانی هێمن مەهابادی، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە** (139)، 1999، **ئاو**

2–**هێمن لەبەر ڕۆشناییدا، ڕۆژنامەی (بیری نوێ)، ژمارە** (169)، 1975/12/6.

**ئەحمەدی شەریفی**

3–**وتووێژی بلاونەکراوە لەگەڵ مامۆستا هێمن، گۆڤاری (گزینگ)، ژمارە** (23)، **بەهاری** 1999.

**ئەسعەد عەدۆ**

4–**لە شیناوێ بۆ شیلاناوێ، ڕۆژنامەی (برایەتی)، ژمارە** (1622)، 1992/4/17.

**ئەمیری حەسەنپوور**

5–**نامەیەك، گۆڤاری (مامۆستای کورد)، ژمارە** (4–5) ، **زستانی** 1987.

**بەکر مەحمود**

6–**هێمن شاعیری کۆڕی خەبات و هەڵگری بیری نەتەوەیی، ڕۆژنامەی (ولات)، ژمارە** (153)، 1996/4/22.

**بورهان شاسوار**

7–**هێمنی مەهابادی شاعیرە ئاوارەکەی کوردستان، ڕۆژنامەی (هاوکاری) ژمارە** (220)، 1974/5/31.

**بێخاڵ ئەحمەد**

8–**یادێك لە دوازدەمین ساڵیادی کۆچی دوایی مام هێمنی مەهابادی، گۆڤاری (گولان)، ژمارە** (221)، **ساڵی** (5)، 1999.

**جەعفەری حوسەینپوور (هێدی)**

9–**ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی حیزب لەسەر هێمن، گۆڤاری (مامۆستای کورد)، ژمارە** (30–31)، 1996.

**جوان بۆکانی**

10–**پێشڕەوانی شیعری نوێ لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، مانگنامەی (پەیام)، ژمارە** (6)، **نەورۆزی** 1998.

**جۆیس بلو**

11–**هێمن ژی مر، گۆڤاری هیوا، ژمارە** (5)، 1985، **(بە ڕێنووسی لاتینی)**.

**حەسنی دانیشفەر (هێور)**

12–**لە یادی چواردەمین ساڵی کۆچی دوایی هێمن، ڕۆژنامەی (برایەتی– پاشکۆی ئەدەب و هونەر)، ژمارە** (173)، 2000/4/21.

**دڵشاد محمد ئەمین (مەریوانی)**

13–**ئاوارەبوون و غەزەلێك، گۆڤاری (ڕۆژی کوردستان)، ژمارە** (5)، **ساڵی** (2)، 1973.

14–**ڕەتکردنەوەیێکی پێشەکییەکەی دیوانەکەی هێمن، ڕۆژنامەی (هاوکاری)، ژمارە** (228)، 1974/10/11.

15–**تاریك و ڕوون لە بۆچوونێکی مرۆڤانەدا، ڕۆژنامەی (هاوکاری)، ژمارە** (243، 244، 245، 247، 148)، **ت 2.. ك.** 1974.

**ڕەحیم لوقمانی**

16–**هێمن و ناڵەی جودایی، گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە** (56)، **شوبات** 2001.

**سەرۆ قادر**

17–**جیێ من پەنا بەردە، ڕۆژنامەی (برایەتی)، ژمارە** (1834)، 1993/12/3.

**سەعید شوان**

18–**هێمن، شاعیری خەم و خاوەن هەڵوێست، گۆڤاری (ئاوێنە)، ژمارە** (21–22)، 1374.

**سەلاحەدینی عەرەبی (ئاشتی)**

19–**ژیان و هێمن، گۆڤاری (سروە)، ژمارە** (143)، 1365.

**سەلاحی شێخۆلئیسلامی**

20–**نامەیەك و وەلامێك، گۆڤاری (سروە)، ژمارە** (159)، **ڕەزبەری** 1378.

**سدیق ساڵح**

21–**لە ڕۆژێکی پایزدا. گۆڤاری (ئێستا)، ژمارە** (12)، **ئایاری** 1998.

**سروە (گۆڤار)**

22–**فایلی (وێژەنامە)، ژمارە** (5)، **بەهاری** 1365، **(تایبەتە بەو وتارو هۆنراوانەی وەکو شینگێڕی بۆ کۆچی دوایی هێمن نووسراون)**.

23–**ڕوونکردنەوەیەك، ژمارە** (151)، **ڕێبەندان** 1377.

**شنە**

24–**مامۆستا هێمن و دیوانی تاریك و ڕوون چەند پرسیارێك، ڕۆژنامەی (هاوکاری)، ژمارە** (234)، 1974.

**عەزیز ئالی**

25–**بایەخی وشە لای هێمن، گۆڤاری (سروە)، ژمارە** (139)، **ڕێبەندان**، 1376.

26–**هەور گەرو ئەشکەولەت، گۆڤاری (سروە)، ژمارە** (146)، **خەرمانان** 1377.

**عەلی پاسبار**

27–**هێمن و ئەوین و بیری کۆمەڵایەتی، کنگرە بزرگداشت فرزانگان کرد، جلد (2)، چاپ اول**، 1377. **انتشارات صلاح الدین ایوبی، ص** 869. **(ئەم سەرچاوەیە کۆمەڵێك بابەتی دەربارەی هێمن گرتۆتەخۆ، کەلە شوێنی خۆی ناویان دێنن بۆ لەمەودوا، کنگرە بزرگداشت.. ص)**.

**عبدالرحمن قاسملو**

28–**شاعیری گەل، تاریك و ڕوون (پێشەکی)، بەغدا**، 1974.

**عبدالکریم شێخانی**

29–**هەندێ یادگاری هێمنانەی هێمن، ڕۆژنامەی (برایەتی– پاشکۆی ئەدەب و هونەر)، ژمارە** (85)، 1998.

ع. سامڕەند

30–ژیاننامەی مامۆستا هێمن، کنگرە بزرگداشت.. ص 881.

عوسمان ئیبراهیم ڕانیەیی

31–یادێك لە بیرەوەری مامۆستا هێمن، ڕۆژنامەی (برایەتی– پاشکۆی ئەدەب و هونەر)، ژمارە (28)، 1997/6/5.

فەرهاد شاکەلی

32–کە تۆ هێشتا لە خەم ناگەی، گۆڤاری (مامۆستای کورد)، ژمارە (2)، ئۆکتۆبەری 1986.

33–لە بەهاری شیلاناویەوە بۆ پاییزی ورمێ، گۆڤاری (مامۆستای کورد)، ژمارە (13،14،15)، سوید، 1992.

34–بە یادی مام هێمن، گۆڤاری (مامۆستای کورد)، ژمارە (15)، 1992.

کاکە فەلاح

35–لە پەنا حەجەکەوە.. خشکەییێك، ڕۆژنامەی (هاوکاری)، ژمارە (246، 247)، 13 و 1974/12/20.

کەریم حسامی

36–پێموایە باشی بۆ نەچووە، ڕۆژنامەی (هاوکاری)، ژمارە (240، 241، 242، 243، 244، 245) ت2.. ك1، 1974.

37–شاعیری ناوداری کورد هێمن، گۆڤاری (پەیڤ)، ژمارە (2)، ساڵی، 1986.

38–یادی هێمن، لە بڵاوکراوەکانی (سەردەمی نوێ)، سوید، 1987.

کەریم شارەزا

39–هێمنی مەهابادی شاعیری خەباتی کوردایەتی، ڕۆژنامەی (برایەتی)، ژمارە (1660)، 1993/6/4.

40–هێمنی مەهابادیو تاقیکردنەوەیەکی ئەفسانەیی لەسەر خۆدا، ڕۆژنامەی (برایەتی– پاشکۆی ئەدەب و هونەر)، ژمارە (21)، 1997/4/17.

کەمال غەمبار

41–چەند سەرنجێك لە تاریك و ڕوون، ڕۆژنامەی (هاوکاری)، ژمارە (251، 252، 253) و ك 2 1975.

کوردستانی موکریانی

42–ئافرەت لە هۆنراوەکانی مامۆستا هێمن، گۆڤاری (بەیان)، ژمارە (26)، 1975.

کۆسار فەتاحی

43–ئاوڕێك بۆ سەر پەخشانەکانی هێمن، گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (17)، 1997.

گوشاد حەمە سەعید

44–کە پشکۆی یادەکان دەگەشێتەوە، مانگنامەی (پەیام)، ژمارە (31)، لەندەن، 2001.

محەمەد عومەر عەلی

45–مامۆستا هێمنم چۆن بینی، ڕۆژنامەی (برایەتی– پاشکۆی ئەدەب و هونەر)، ژمارە (26)، 1997/5/22.

محمد امین احمد

46–هێمن و سکاڵا، گۆڤاری (بەیان)، ژمارە (51)، 1979.

47–قۆناغەکانی شیعری هێمن، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (75)، 1979.

48–زمان لە شیعری هێمندا، گۆڤاری (بەیان)، ژمارە (59)، 1980.

49–مەیو مەیخانە لە شیعری هێمندا، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (79)، 1980.

محمد فریق حسن

50–هێمن و بۆنی غەریبی، گۆڤاری (بەیان)، ژمارە (65و 66)، 1980.

محمدی حاجی کەریم

51–هێمنی شاعیرو پرۆسەی داهێنان، ڕۆژنامەی (برایەتی– پاشکۆی ئەودەب هونەر) ژمارە (36)، 1997/7/31.

محمدی مەلا کەریم

52–با منیش لێرەوە پەنجەیەکی تێوەردەم، ڕۆژنامەی (هاوکاری)، ژمارە (256)، 1975/2/28.

53–دێباچە، ناڵەی جودایی، (پێشەکی)، بەغدا، 1979.

54–لە نێوان مامۆستایان تۆفیق وەهبیو هێمن موکریانیدا، گۆڤاری (بەیان)، ژمارە (184)، 1999.

مەحمودی شکاك نەژاد

55–چەند فەرازێ لە وتاری مەحمودی شکاك نەژاد، کنگرە بزرگداشت.. ص 889.

ناسری ڕەزازی

56–یادێك لە مامۆستا هێمن، گۆڤاری (مامۆستای کورد)، ژمارە (22)، هاوینی 1994.

نوری عەلی ئەمین

57–هێمن لە گوڵزاری ئەدەبی کوردیدا گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (141)، 1998.

هیوا عومەر امین

58–دینامیکیەتی بیرۆکەو شاعیری لە نێوان هێمن و هەڵمەتدا، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (66)، ئادار 1978.

هێدی

59–یادی هێمن، ڕۆژنامەی (برایەتی– پاشکۆی ئەدەب و هونەر)، ژمارە (72)، 1998.

هێرش

60–هێمن و من، شیرکەتی کتێبی هەرزان، سوید، 1992.

یونس ڕەزایی

61–هێمن– شاعیرێك لە مەیدانی سووتان و هەرماندا، کنگرە بزرگداشت.. ص 876.

دووەم: عەرەبی

حسین محمد سعید

62–اسهاما في النقاش الدائر، جريدة (طريق الشعب)، العدد (370)، 1974/12/16.

سين

63–بالقلم العريض، جريدة (خەبات)، العدد (972)، 2000/4/21.

کەریم شارەزا

64–هێمن.. شاعر النضال و انين الفراق (1921–1986) جريدة (خەبات)، العدد 0972)، 2000/4/21.

کەمال غەمبار

65–هيمن المكرياني شاعر الغربة و النضال، مجلة الثقافة الجديدة، العدد ()، ايول– ت1، 1975.

## سێیەم: فارسی

محمد مرتضایی

66–نگاهی بە شعر معاصر و سرودهای دوشاعر کرد، ماهنامە (ادبستان)، شمارە (17)، اردیبهشت، 1370.

*مەبەست ئەو وتارو نووسین و لێکۆڵینەوانەیە کە ئێمە توانیومانە بە گوێرەی دەرفەت سۆراغیان بکەین و بیان بینین، ڕەنگە هی دیکەش هەبن کە ئێمە دەستمان پێ ڕانەگەیشتبێ.

ەژار بۆ هیمن

کەتم گرتوە، هەر دووك جار تەشریفی شەریفت لەوێ
ەریکی دیوانی نالی بووین، خودا ئەویشی وەك ئیمە
ەتی تیدا هەن و جاری وایە لامان سەیر بوو ئەتۆ چۆن
یکی پیدا بکەم و نەقدیکی لەسەر بنوسم، چونکە نالی

بکەن تا بۆتان بنیرم و بە قەرزداری نەمینمەوە.
س کردووی، بەڵام گالتەو گەپیکیان لیپەیدابوە رەنگە
ەحمەد، ئەگەر گیانی سپۆرتت هەبێو لیمان قەلس
ەرێ تۆ دەنگ: نوسراوە "کرد در تاریخ همسایگان"
، ئەگەر "کاك فاروق" بەشیکی دیکە لە تورکیەکەی
اش بوو. دەنا ئەوەم پێ شت نییە، سەیاحەتنامەی

جوار دەرکەوێ چونکە بەهار بۆ باسی زستان نابێ.
رهاویژراوەو تەلاقی لە سەر خوراوە کە هی وەفایی
 وەفاییەو ئەمەش شاکاریەتی. دە ئەگەر ئی ئەو نییە
. دەبوایە تەنیا لە جیی کەلیمەی "رانی لووسی" کە
ن.
مالی ئیمەیە زۆر سەلام و عەرزی ئیخلاسی هەیە،
ح ماچ دەکەم. ئەگەر خات نەسرینی جەعفەریت دیت
انی خیرو شەرەیە کە نیزامی لە "حەوت پەیکەر"دا
ی داستانی نیزامی کوردیکی مەردار بوەو زۆریش
بکردایە. زۆرم رست، بمبەخشە.

برات

هەژار

64/1/25


**(رۆڤار) بڵاوکراوەیەکی رۆشنبیریە**

**هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك**

**دەزگای چاپو پەخشی سەردەم هەر دوومانگ جارێك دەری دەکات**

**ناونیشان**

**سلێمانی -فولکەی یەکگرتن - دەزگای چاپو پەخشی سەردەم رۆڤار**

**ت / 3120690**

**لەدەرەوەی کوردستان**

**Fax: 00441628477660 - Tel: 004162846008**

**چاپخانەی (رەنج)**

**سەرپەرشتی گشتی: شێرکۆ بێکەس بەرێوەبەری رۆڤار: دڵشاد عەبدوڵڵا سکرتێری رۆڤار: یاسین عومەر تایپو مۆنتاجی کۆمپیوتەر: جەمال حسین**